## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەممەد مەولود (مـەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارە ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هـەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەممەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، ڕەفیق چالاك، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەممەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەممەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵا پەشێو، جگەرخوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەممەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادری کۆیی، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحمودی بایەزیدی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شاربازێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحموی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورەی کۆیە، تۆفیق وەهبی بەگ، محەممەد ئەمین زەکی، عەبدوڵڵا جەوهەر، مستەفا بەگی کوردی، شێرکۆ بێکەس، سالم، عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، ئەحمەد کایا، مەولەوی،قانیع.عوسمان چێوار.کەریم کابان،ڕەفیق حیلمی، مستەفا زەڵمی.ئازاد شەوقی، شێخ نووری شێخ ساڵەح، نوورسی.


سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
ئیدریس عەلی

گرافیك دیزاین
ئارام عەلی

تیراژ: ١٢٠٠

نرخ: ٢٠٠٠

ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

www.serdem.net

پەیوەندیکردن بەڕۆڤارەوە لەڕێگەی
ئیمێڵی
edrisali16@yahoo.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

سەرۆکی فەخری
شێرکۆ بێکەس

سەرۆکی دەزگا
ئازاد بەرزنجی

بەڕێز فاروق مەلامستەفا سپۆنسەری ئەم ژمارەییەی کردووە

## ئەحلام.. خەونێک لە تەنیاییدا

کە لە نزیکەوە ئەحلامم ناسی، هێشتا سەری خەمەکانی بە تەواوی واڵا نەکردبوو. لە پەنایەکی پایتەختە جوانەکەی ئەوسادا، هێدی هێدی، بە شەرمەوە ڕووی لە خوێندنی زمان کردبوو. ئەو پێشتر بە زمانی نووسین و خوێندنەوەی کوردی ڕانەهاتبوو. کە لە ساڵەکانی حەفتادا یەکەم چیرۆکی بڵاو کردەوە، من چەند سەرنجێکی خۆمم لە ڕۆژنامەی هاوکاریدا لەسەر نووسی کە زۆری پێ خۆش بوو، تەنانەت لە هەندێک لە دیمانە و یادەوەریی خۆیدا باس لەو دەستخۆشیلێکردنەی من دەکات. کە دوای ڕاپەڕینیش بە هاندانی هەندێکمان هاتە سلێمانی و لە زانکۆ بوو بە مامۆستا، ئیتر زۆر جار دەهاتە ماڵی ئێمە و دەمایەوە. چونکە جگە لە حەزی دۆستانەی نێوان من و خۆی دەربارەی باسە گەرموگوڕەکانی ئەدەب، هاوڕێی قۆناغێکی قوتابخانەی هاوسەرەکەیشم بوو. ئەحلامی بەغدا و سلێمانی دوو کەسی تا ڕادەیەک جیاواز بوون. لێرە دەنگی خەمەکانی بەرز بوون و نووسینی زیاتری هەبوو. بەتایبەتی لە ڕۆژنامەی هاوڵاتیدا کە مینبەری دەنگی ئازاد و بێزاریی ئەوسای خەڵکی بوو. بەڵام تا دەهات، دەکەوتە نێو دنیای تەریکی و گۆشەگیرییەوە. تەنیاییەک جگە لە جگەرەیەکی بێمنەتی و گۆشەگیرییەکی بێدەربەست و خەونێکی لەدەستچوو، چ هاودەمێکی تر پەی بە نهێنییەکانی ناوەوەی ئەوی نەدەبرد.

لە کۆمەڵەچیرۆکی پرددا کە یەکەمین بەرهەمیەتی، کچێکی نووسەر دەبینیت، یاخی لە داب و نەریتی کۆمەڵایەتی و یاسا ژەنگگرتووەکانی، کچێک، پڕ لە خۆزگە و سەرهەڵگرتووی ڕێگەی دووری خۆسەلماندن و بەرگریکردن لە نەوە و هاوڕەگەزەکانی و عاشق بە ئازادی. ئیتر ئەوە ئەو کاتەیە کە ئەحلام بەردەوام دەڵێت نا، نایەک وەک ئەنجام بە داخیەوە سەردەنێتەوە، بەڵام ئاڵاکەی ناکەوێت. نایەک پڕ بە شکۆمەندیی ئەو ژنە بەهرەمەند و داهێنەرانەی نەیانویستووە کۆیلەی پیاو بن و لەسەر خوانی ئەوان بژین. کێ دەتوانێت هەر لە بواری ئەدەبدا نکۆڵی لە توانای ڤێرجینیا وۆلف و فرانسوا ساگان و دووریس لیسینگ و ئەلیزابێس ئەلیندی و فروغی فەروخزاد و ئەلیف شەفەق و دەیان ناوی درەوشاوەی تری ژن بکات. ئەگەر کۆتوپێوەندی کۆمەڵایەتی و یاسا هەرە دواکەوتووەکان بهێڵن، ژمارەی داهێنەرانی ژن لە هەموو بوارەکانی ژیاندا لە پیاو کەمتر نابێت. بەڵام لە ئێستادا چی لەو زیندانە دەکەیت کە بەردەوام ئەحلام هەستی پێ دەکرد و ئاگرە دۆزەخئاساکەی دەیسووتاند. ئەحلام شایانی ئەوەیە زۆری لەسەر بنووسرێت، خەڵات و شوێنی بە ناوەوە بنرێت. بەڵام بە داخەوە، لای ئێمە مردن دواقۆناغی جەستە و بیر و بەرهەمیشە. ئەم ژمارەیەی ڕۆڤاریش پێزانینێکی خاکەڕایانەیە بۆ ئەو خاتوونە خۆشەویست و نووسەرە بەهرەمەندە.

**سەرنووسەر**

# ژیاننامەی ئەحلام مەنسوور

ئەحلام مەنسوور لە ساڵی (١٩٥١)، لە گەڕەکی هەژارنشین و لانکەی خەباتی شیوعی، (عەبدوڵڵا بەگی خانەقین) لە تەنیشت پیسی (کۆردەرە) لەدایک بووە، بەڵام نزیک لە باخی هەنار و پرتەقاڵ و لیمۆ و خورما و توو و گوڵەباخەکەی (مەحمود مەسعود) لەدایک بوو، لەو گەڕەکەدا کە چەندین ڕابەری شیوعیی وەک (نەسرەدین مەجید، محیدین دای زادە، کەمال یاسین و ئیبراهیم نایف) لەدایک بوون و ژیان. ئەڵوەن ڕۆحی یاخیبوونی بە ناوی (نان و ئاو و کاری هاوبەش) لە گیانی کچەکەیدا ڕواند و ئەمیش هەر لە منداڵییەوە ڕوخساری قێزەونی زوڵم و زۆرداریی ناسییەوە و لە نێو ئازار و نەهامەتییەکانی هەژاراندا پێ گەیشت و پاشان جانتاکەی پێچایەوە و ملی ڕێگەی هاتونەهاتی گرتە بەر. باوکی ئەحلام (مەنسوور عەلی ئەکبەر) لە (پاڵاوگەی ئەڵوەن کارمەند بوو، دایکیشی (ڕەسمیە محەمەد ساڵح) کچی (حاجی محەمەد ساڵح بەزاز) بووە، چوار برا و خوشکێکی هەیە. ئەحلام لە ساڵی (١٩٥٦) دەخرێتە بەر خوێندن و لە ساڵی (١٩٦٢) قۆناغی سەرەتایی و ساڵی (١٩٧٠) قۆناغی ناوەندیی و ئامادەیی لە (خانەقین) تەواو کرد و هەر لەم دەمەیشدا بوو بە ئەندامی حزبی شیوعیی عێراق.

لە ساڵانی خوێندنی ئامادەیدا لەگەڵ هاوڕێکەی (لەیلا قاسم) پێکەوە چالاکیی قوتابخانەیان بە ڕێوە دەبرد. پاشان ساڵی (١٩٧٠) لە بەشی زمانی کوردیی زانکۆی (بەغدا) وەرگیرا و هاوڕێکەیشی (لەیلا قاسم) لە بەشی کۆمەڵناسی وەردەگیرێت. ئیدی لەوەیش بەدواوە ئەحلام هۆگری ئەلفبای زمانی کوردی بوو، هاوڕێکەیشی ئاشنایەتیی لەگەڵ کتێبەکانی (عەلی ئەلوردی) پەیدا کرد و لە بەشی ناوخۆیی کۆلێژی ئاداب پێکەوە درێژەیان بە خوێندنەکەیان داوە.

هاوکاتیش ئاشنایەتیی لەگەڵ هەردوو مامۆستا (ڕەفیق سابیر) و (هێمن)ی شاعیردا پەیدا کرد کە بێگومان ڕۆڵیان لە پێگەیاندنیدا دەبێت و فێری چیرۆکنووسین و خوێندنەوەی مارکسیزمیان کردووە. هەر لەم دەمەیشدا ئەحلام چەند شیعرێکی کورتی بە زمانی عەرەبی و چەند کورتەچیرۆکێکی بڵاو کردەوە.

شاعیری عێراقی، حەمید قاسم لەبارەی ئەحلامەوە دەڵێت: «ئەحلام زۆر ماندوو بوو، وەکو هەر جەنگاوەرێک لە زۆر بەرەدا دەجەنگا، بەدبەختیی زۆر پاڵی پێوە نا بەرەو بێدەنگی و سەرقاڵبوون دوور لە داهێنانەکەی.»

وەک یەکەمین ژنەڕۆژنامەوانی کورد لە ساڵی (١٩٧٤-١٩٧٥)دا لە دەزگای هاوکاری بۆ بڵاوکردنەوەی کوردی دامەزراوە و دەستی بە کاری ڕۆژنامەوانی کردووە. لە ساڵانی هەشتاکانیشدا دەستی کردووە بە نووسینی چیرۆک و ڕۆمانی کوردی. یەکەم نەوبەرەشی بە ناوی (ئامە ڕەش)ەوە بڵاو کردەوە کە باسی لە ڕووداوەکانی شاری (خانەقین)ی کردووە.

لە ساڵی (١٩٨٥)دا کۆمەڵەچیرۆکێکی کورتی نووسی و لەژێر ناونیشانی (پرد)دا، کە وەک ڕۆمان لە قەڵەم دراوە، بڵاوی کردەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ناحەزی زۆر بوون، پێی نەکرا بەرهەمەکانی لە چاپ بدا.

لە ساڵی (١٩٨٨)یشدا ڕۆمانێکی بە ناوی (ئەڵوەن)ەوە نووسی کە دەتوانین بڵێین یەکەمین بەرهەمە بە زمانی کوردی لە بواری (ڕۆمانی فێمینستیی سۆسیالیستی)دا. لەم ڕۆمانەدا قارەمان (ئامە ڕەش) و دەیان ژن و کچی هەژار بە هەموو کێشە و ئاریشەکانیانەوە لە سەرتاسەری ڕۆمانەکەدا دێنە گۆ.

هەر لەم ساڵانەدا تووشی چەندین کێشە و گرفت بووە. لەم کاتەدا لە گۆڤاری (وعی العمال) کار دەکات و پاشان کە فەرمانگەی کشتوکاڵ دامەزراوە، لە کارەکەی دەرکراوە.

ئەحلام لە ساڵی (١٩٨٦)دا هەگبەکەی هەڵگرت و ڕووی لە دەرەوەی وڵات کرد. چوو بۆ (پاریس) و لە زانکۆی (سۆربۆن) وەرگیرا کە ماوەی دوو ساڵ لەوێ لە خوێندن بەردەوام بوو، وەلێ بە هۆی دەستکورتی و سەرنەکەوتن و بێزاربوونیەوە (پاریس)ی جێ هێشت و گەڕایەوە بۆ (عێراق).

پاش گەڕانەوەی بۆ (عێراق) تووشی نەخۆشییەکی دەروونی بوو، پاشان سەردانی پزیشکی کردووە و نەخۆشییەکەی چارەسەر کراوە، هەر لەم ماوەیەشدا کاری بۆ دەزگای (ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی) کردووە.

پاش ڕاپەڕینی بەهاری (١٩٩١) لە شاری (سلێمانی) جێگیر بووە و هەر لە (زانکۆی سلێمانی) لە بەشی ڕاگەیاندن و کۆمەڵناسی دامەزراوە و درێژەی بە بەرگریکردن لە ژنان و هەژاران دا.

ئەحلام مەنسوور جگە لە ڕۆمانی (ئەڵوەن) و (پرد)، چەند کتێبێکی تریشی بڵاو کردووەتەوە، وەک: (خەون و خوێن)، هەروەها (دیس تۆپیا) و کتێبی (ئەزموون). ساڵی ١٩٩١ بڕوانامەی ماجستێری لە کورتەچیرۆکدا وەرگرتووە و دواتریش دەزگەی چاپ و پەخشی سەردەم بۆی بڵاو کردووەتەوە.

پاشان لە ساڵەکانی (٢٠٠٠) بەدواوە وەکو نووسەر لە ڕۆژنامەی (هاوڵاتی) دادەمەزرێت و پاشان دەست دەکات بە نووسینی وتار، لە ساڵی (٢٠٠٩)ەوە لە دەزگای (چەتر) بەردەوام دەبێت و گۆشەیەک بە ناوی (خەون و خوێن)ەوە دەنووسێت.

ئەحلام وەک خۆی لە کتێبی (ئەزموون)دا دەڵێت: «لووتم بەرزە، لە کەلی شەیتان نایەمە خوارەوە، خاوەن قسە و هەڵوێستی خۆمم.» کچەکەی ئەڵوەن هەر بەو شێوەیە و بە لووتبەرزی لە بەرانبەر پارە و دەسەڵات مایەوە، تا لە ڕێککەوتی (٢٠١٣/١/١٠) دڵە گەورە و میهرەبانەکەی لە لێدان ڕاوەستا و ماڵئاوایی لێ کردین.

# ئەحلام مەنسوور
# ژنێ لە حیلەی یاخیبوون!

## (پەخشان)
## شێرکۆ بێکەس

تابووتێ لە شەو
شەو لە ژنێک و
ژنیش لە ئەڵوەن.

ئەمە لاواندنەوەی کۆتایی ئەو چیرۆکە بوو کە ناوی «ئەحلام مەنسوور» بوو. ئەو لە شارێکدا گەورە بوو کە هەژاریی و پاییز و وەرینی ژن و تەوری پیاوی تێدا هەرە هەرە باڵا دەست بوو. گەرچی شار لەسەر ڕووباری زێڕی ڕەش و لەسەر خەزنەی گەوهەر و ئەڵماس پاڵکەوتبوو. وەلێ نان لە قورگی ئەژدیهادا بوو. دوای لەدایکبوون، ئەو مامانەی ناوکی ئەبڕی، ئاینێکی پیرێژنی هەزار ساڵە و پەنجەی درێژ و ڕەقەڵەی زەبر و زەنگی خورافات و نینۆکەکانی ئەفسانەی بیابانێکی تینوو بوو.

بێچووە پشیلە زۆر لە کچ،
بەخت و حورمەتی زیاتر بوو!
«ئەحلامێ» لە تەم،
تەم لە سەراب و

سەرابیش لە خەم،
خەم لە ژماردن نەئەهات. لە گوێ ئاوی ئەڵوەنیشدا،
ئەحلام خەونی ئەدا بە دەم شەپۆلەکانی سبەینێ
و ماسییەکانی دواڕۆژەوە. وەک شەنگەبییەکی
جوان، بەڵام شەوانە بە دەم «با»ی لەناو بەردەوە
هەڵکردووی شاخانەوە، شیعرێ بوو سەمای
ئەکرد.
کچێ لە خۆزگە
خۆزگە لە ڕێگە و
ڕێ لە کتێب و
کتێبیش لە دڵ:
کەوتە خوێندنەوە، کەوتە هەڵکەندن، کەوتە
باڵگرتن، نووستنی فڕێدا و بوو بە پەروانەی
عەشقی چیرۆک و عەشقی ڕۆمان و شیعری
کەڵەگەت، هەتا بەیانیی.
لەسەرەتادا
لای «پێغەمبەر»ی
«جوبران» دەرسی خوێند
لە «شێت»ەکەی ئەو، عەقڵی داگیرسان
بە «باڵی شکاو» کەوتە فڕین و
گەیشتە بەغدا و... گەیشتەماڵی
کورتە چیرۆکی «فوئاد تکرلی» و
کەناری دیجلەی قەسیدەی «سەیاب»
بەغدای ئەو دەمە، ئەوەندەی عەقڵی «وەردی» و
«جەواد سەلیم» و «تەها باقر» و چراکانی سەر
«ئەبو نەواس» زیندوو بوو. ئەحلام گەیشتە
کۆلیج و
بەسەر پلیکانەکاندا سەرکەوت، بەڵام مێیەکی
ئاسایی و
کچێکی هەروا شوێن کەوتووی قەدەر نەبوو
کچێ لە چرا
چرا لە هزر و
هزری یەکسانی و
شەوقی یاخیبوون.
لە «نەوال»ەوە جەستەی خۆی باشتر ناسی، لە
«سیمون دی بۆڤوار»ەوە، بازنەکانی یاخیبوون
گەورەتر بوون. چووە سەر شەقامی «پیاو» و
پرچەکانی کرد بە ئاڵا، چووە سەر مزگەوتەکان و
یەخەی داب و نەریتی گرت،
یەخەی منارەی شاری گرت، یەخەی یەکڕەنگی و
یەکدەنگی و بێدەنگیی گرت، جیاوازییەکانی ماچکرد
و
باوەشێکرد بە ئازادی تاکەکەسدا و لە هەوری مێ،
جوانترین
بارانی باراند، ڕۆژژمێری باوی دڕان، لەبەرچاوی
هەموو دنیا، مەمکەکانی خۆی دەرهێنا و دوو
گڵۆپی بۆ
بیری تاریکستانی عێراق و کوردستان، زیادکرد.
ڕۆژنامەی کرد
بە پەنجەرە،
پەنجەرەی کرد
بە ئایندە و
زمانی شەرمنی ژنی
هەڵدایە ناو ئاگرەوە.
ئەحلام چیرۆکی جوانی داینێ، ڕەنگ و دەنگی جوانی
داینێ، وەلێ جوانیی هەرە گەورەی ئەم ئەحلامە،
لەوە دابوو ئازایەتی گەورەی داینێ! حەقیقەتی
ڕووت و قووتی خستە بەردەم کۆمەڵێکی دەغەزار
و ترسنۆکی، ڕەگەزەکەی
خۆی ڕسواکرد.
ژنێ لە حیلەی یاخیبوون.
حیلە لە دەنگی بوێر و
لە تێکشکانی قەدەغە و
لە بەزاندنی
سنوورەکانی حەرام و،
لە یەککگرتنەوەی
شەقام و ئازادی ژن.
ئەحلام مەنسوور
وشەیەکی مێی گڕگرتوو،
کە دڕی بە دارستانی
چەقۆی پیاودا و
بەو مەرگەدا هەنگاوی ناو
نەگەڕایەوە بۆ دواوە و...
کڕنووشی بۆ «ئینس و جن» و
مێژەری خورافات نەبرد،
هەتاکوو مرد!

# ئەحلام مەنسوور کێیە؟

**ئەحلام مەنسوور**
**حەمید عەزیز**

خەباتگێڕ و کۆڵنەدەر لە دنیای ئەدەب و نووسین و وێژەدا، مامۆستا و نووسەری ماندوونەناس لە بەرەوپێشچوونی مەدەنییەت و شارستانییەت و دروستبوونی کۆمەڵگەی عەقڵانی، بوێر لە شکاندنی کۆتوبەندە کۆمەڵایەتییە سەقەتەکاندا، قسەکردن و خاوەنی ڕای تایبەتی خۆی لەسەر هێڵە سوورەکانی کۆمەڵگەیەکی دواکەوتووی خاوەن مێژوویەکی دوور لە زانست و پڕ لە خورافە و ناعەقڵانیی وەکو سیاسەت و ئافرەت و ئایین و پیاو و...
بە ڕاستی خاتوو ئەحلام مەنسوور مرۆڤ و نووسەر و مامۆستا و ڕۆشنبیر و خەمخۆری دنیای یەکسانی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و چاکسازی و پێشکەوتن و مەدەنییەت بووە و لە هەمان کاتیشدا کاری سەختی بەرگری لە ئافرەتان و دژە پیاوسالاری و دژە بیری خێڵ و خورافە و دواکەوتنی خستووەتە ئەستۆی خۆی کە ئەمە لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا کارێکی سەخت و گرانە.
خاتوو ئەحلام نووسەر و ئەدیب و زمانزان و چیرۆکنووسێکی ناسراوی کورد بوو. ئەمە بێجگە لەوەی کە ماوەیەکیش نووسەری ڕۆژنامەی ئاوێنە بووە و چەندین کتێب و نووسین و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی

و ئاکادیمیی لەبارەی ڕۆڵی ژنان و گەنجانەوە نووسیوە.
خاتوو ئەحلام مەنسوور جگە لەوەی وەک نووسەرێکی لەڕادەبەدەر یاخی و بوێر ناسرابوو، لە هەمان کاتدا مامۆستای بەشی ڕاگەیاندنی زانکۆی سلێمانی بووە. ئەوەی شایانی باسە، لە کۆتایی حەفتاکاندا کۆمەڵەچیرۆکی پرد بڵاو دەکاتەوە، لەگەڵ ڕۆمانێکی بەنرخ بە ناوی ئەڵوەن. خاتوو ئەحلام خاوەنی بڕوانامەی ماستەر بووە لە زانکۆی بەغداد.
خاتوو ئەحلام لە ناو هەموو ئەدیباندا، لە ناو هەموو ژنان و پیاوانی ڕۆژهەڵاتیدا کەڵەژن بوو و وریا و وردبین بوو. هەر بۆیە پاش خۆی بەرهەمە ئەدەبی و کۆمەڵایەتییەکانی بە زیندوویی دەمێننەوە و جێی شانازیی نەوەی دواڕۆژی نەتەوەی کوردن. ئەوەی شایانی باسە و زۆر گرنگە بۆ کۆمەڵگەی کوردەواری، ئەوەیە خاتوو ئەحلام مەنسوور بە تەنها لە ڕێگەی نووسینەوە کۆمەڵگە و سیاسەت و ئایین و کولتووری پیاوسالاریی نەخستبووە ژێر پرسیارەوە، بەڵکو بە شێوەیەکیش دەژیا کە هەموو ساتێکی بریتی بوو لە پراکتیزەکردنی ئەو ڕەخنانەی خۆی، چونکە وەکو خۆی دەژیا و درۆی لەگەڵ ڕۆحی خۆی نەدەکرد. خەڵکانێکی زۆر هەن وەکو سیاسەتمەدار و نووسەر و مامۆستا و... کە وەکو خۆیان ناژین و لەبەر عەیبە و کۆمەڵگە درۆ لەگەڵ ڕۆحی خۆیان دەکەن و نایانەوێت تەجاوزی شتە سەقەتەکانی کۆمەڵگە بکەن، نەوەکو لە کۆمەڵگەدا ناشرین بن. بۆیە زۆرن ئەوانەی بە قسە و نووسین شۆڕشگێڕن و لە دیوێکی تریشدا هاوشێوەی کەسانی دەستەمۆی داب و نەریتی سەقەت ژیان و گوزەرانی خۆیان دەکەن. بەڵام ڕاستگۆیی ئەحلام لەگەڵ بیرکردنەوە و هەڵوێستیدا نموونەیەکی ناوازەیە لە تێکەڵکردنی قسە و ڕەفتارەکانیدا، نموونەیەکە لە ئازادیخوازی و شۆڕشگێڕبوونی ڕاستەقینە کە لە کولتووری کوردەواریدا هاوشێوە و نموونەی دەگمەنە.
ئەحلام مەنسوور وەکو مرۆڤ و نووسەر و ڕۆشنبیر دەیویست مرۆڤەکان بە ئازادی بژین و داگیرکردنی مرۆڤ و خەساندنی تێدا نەبێت لە لایەن دەسەڵاتی خراپ و ناڕەواوە، بۆیە دەیویست مرۆڤ بە گەورەیی سەیر بکرێت و ئازادیی کردبووە قوتابخانە بۆ پێگەیاندنی کۆمەڵگە و پێشکەوتن و مەدەنییەت.
خاتوو ئەحلام ملی بۆ گەمژەیی دەسەڵات و سەقەتیی بیر و ئەندێشەی کۆمەڵگە نەدا، چونکە دەیویست گۆڕانکاری بکات و سوور دەیزانی ئەم کۆمەڵگە و دەسەڵاتە ڕۆژهەڵاتییە زۆر سەقەتە و زۆری دەوێت و ماندوو دەبێت، کەچی هەر کۆڵی نەدا، بۆیە ئەوە یەکێکە لە خەسڵەتە باشەکانی هەر نووسەرێک کە نابێت بوەستێت و کۆڵ بدات.
ئەحلام بە تەنها بە نووسین لە پەڕە و ڕۆژنامەکاندا ڕەخنەی لە کۆمەڵگە و دەسەڵات نەدەگرت، بەڵکو هەڵبژادنەکانی ژیانی کردبووە سیمبول و ڕەمزێک بۆ ئەو ئازادییەی بڕوای تەواوی پێی بوو، ئەو داکۆکییە ڕاستەقینەیەشی کە لە بەها مرۆییەکانی دەکرد.
ئەوە زۆر گرنگ بوو بە لای خاتوو ئەحلامەوە کە پرسی ژن لە کۆمەڵگەی کوردیدا پرسی ئازادیی مرۆڤەکانە، هەروەکو چۆن پرسی کۆیلایەتی لە مێژوودا پرسی ئازادیی سەرجەم مرۆڤایەتییە.
خاتوو ئەحلام مەنسووری ژن نموونەیەک بوو لە ژن کە لە ڕێگەی ژیان و هەڵسوکەوت و ڕەفتار و کرداری ڕۆژانە بە ڕۆح و بە گیان بەرگریی لەو ئازادییە دەکرد.
زۆر بە داخەوە، کۆچی دوایی خاتوو ئەحلام مەنسوور لەدەستدانی سیمبولێکی گەورەی نەتەوەی کورد بوو. زۆر بە داخەوە کە لە تەمەنێکی کەمدا بەجێی هێشتین. بە دڵنیاییەوە زیانێکی گەورە بوو لە ئەدەب و نووسین و وێژەی کوردیدا، بێجگە لەوەی کە زیانێکی گەورە بوو لە ئازادی و ڕاستگۆیی و بەرگری.

**٢٢/١/٢٠١٣**

# کۆژانی کۆمەڵ لە ئاوێنەی ئەڵوەندا

**لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەییە سەبارەت بە ڕۆمانی (ئەڵوەن)ی ئەحلام مەنسوور**

**مەهاباد قەرەداغی**

### پێشەکی

ئەڵوەن ڕۆمانێکی ٢٠٦ لاپەڕەیی قەوارە گەورەیە و ئەحلام مەنسوور نووسیویەتی، چاپکراوی ساڵی ٢٠٠٤ی دەزگای چاپ و پەخشی (ئاراس)ە. لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا نووسەر مێژووی ١٩٧٩-١٩٨٠ی نووسیوە کە دەکاتە ساڵی دەستپێکردن تا تەواوکردنی ڕۆمانەکە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ڕۆمانەکە بیستوچوار ساڵ بە دەستنووسی ماوەتەوە و لە بەردەستی نووسەردا بووە بۆ دەسکاری و گۆڕانکاری. ساڵی ٢٠٠٤ ڕۆمانەکە دەکەوێتە دەستی خوێنەران کە دەکاتە هەمان ساڵ کە هەمان دەزگای پەخش و چاپ خەڵاتی بە نووسەر بەخشی لە سۆنگەی ئەزموونی ئەدەبی و پڕبەرهەمیی نووسەرەوە.

ئەم لێکۆڵینەوە ئەدەبییە تاوتوێکردنێکی ڕۆمانی ئەڵوەنە لە گۆشەنیگایەکی فێمینیستانەوە، چون خوێندنەوەی ڕۆمانی ئەڵوەنی ئەحلام مەنسوور هەر لە لاپەڕەی یەکەمەوە و لە سۆنگەی گێڕەرەوە و شاکەسەکەیەوە، کە هەردووک بە ڕادەیەک سەرنجڕاکێش و تایبەتن، خۆیان دەبنە چاوساغ و ڕێڕۆشنکەرەوە لە بەردەمی ڕەخنەگردا کە بە گوزەری کۆمەڵناسیدا پیاسەکەی دەست پێ بکات و چاویلکەیەکی فێمینیستانەشی لە چاودا بێت، چونکە لە هەر هەنگاوێکدا کە دەینێت، پێی لە ڕووداوێک هەڵدەکەوێت، جیاوازیی جێندەر و کێشەی توخمبەندی لە بەرژەوەندیی نێرێکی خۆسەپێنەر بەسەر مێدا بەرجەستە دەکات.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەدوای وەڵامی چەند پرسیارێکدا دەگەڕێین، کە ئەمانەن:

ڕۆمانی ئەڵوەن، لە ڕووی هەڵسەنگاندن و بە پێوەرە ڕەخنەییەکانی ئەدەب، دەچێتە بۆتەی چ جۆرێکی

ڕۆمانەوە و ئاستی هونەریی ئەم ڕۆمانە چەندە؟
ئەحلام مەنسوور، بۆ چ مەبەستێک ڕۆمانی ئەڵوەنی نووسیوە و پەیامەکانی نێو ڕۆمانەکە چین؟
هۆشیاریی فێمینیستیی نووسەر لە میانەی ڕۆمانی ئەڵوەنەوە چۆن دەردەکەوێت؟

## بینای هونەریی ڕۆمانی ئەڵوەن

وەک ڕ.م. ئەلبیریس دەڵێت: "ڕۆمان هونەرێکی جیهانییە، مەبەستی جێگرتنەوەی شوێنی هەموو هونەرە ئەدەبییەکانە."[١] ئەمەش فراوانیی دنیای ڕۆمان دەگەیەنێت کە هەموو ژانرەکانی ئەدەبی تێدا کۆ دەبێتەوە و لە لایەن نووسەرەوە تێهەڵکێشێکی هونەری دەکرێت.

ڕۆمان ژانرێکی ئەدەبیی پڕ وردەکارییە و بە شێوەیەکی هونەری بینا دەکرێت. وەک چۆن بیناکردنی ماڵێک پێویستی بە بناغەیە، بە دیوار و بە دەرگا و بە پەنجەرە و بنمیچە، جگە لەوانەش، دەیان وردەکاریی تری ناواخنی بیناکە تا بە کەڵکی تیاژیان بێت، ئاواهییش بینای هونەریی ڕۆمان پێویستی بە گشت ئەمانە و بە کەرەستەی هونەری هەیە و هەر یەک لەمانەش نەریت و پێوەری خۆیان هەیە و نەخشەیان پێویستە، واتە بە هەڕەمەکی بونیاد نانرێن.

بناغەی ڕۆمان، یان ژێرخانی هونەریی ڕۆمان بریتییە لە چیرۆکێکی سەرنجڕاکێش و نائاسایی. ئەو چیرۆکە یان زادەی خەیاڵ و فەنتازیای باڵای نووسەرەکەیە، یان ڕووداوی ڕاستەقینەن و نووسەر دەیانخاتە بۆتەیەکی هونەری و لە ڕۆماندا شکڵ دەگرن. بە هەردوو بارەکەیدا، نووسەری ڕۆمان پێویستی بە کۆمەڵێک کەرەستە و ئامرازی هونەری دەبێت بۆ بۆ ڕۆنانی بینای ڕۆمانەکە. چیرۆکێکی بەهێز و بەپێز بناغەی ڕۆمانێکی سەرکەوتووە کە لە ناو ئەم چیرۆکەدا پێویستە ئەمانە هەبن:

گێڕەرەوە (Narrator).
شاکەس (Protagonist)
دژەکانی شاکەس (Antagonist).
کارەکتەرە ماماناوەندییەکان (Secondary Characters).
کارەکتەرە لاوەکییەکان (foil characters).
شوێن و کات (Setting).

گێڕەرەوە؛ پێویستی بە ئامرازی جۆراوجۆرە بۆ باسکردنی ڕووداوەکان، ناساندنی کارەکتەرەکان و پیشاندانی گرێکان و ئاماژەدان بە پێشهاتەکان و پەیامەکان. ئەو ئامرازانەش بریتین لە زمانێکی هونەری، بەکارهێنانی شەپۆلی هۆش لە شێوەی مۆنۆلۆگی ناوەکی، فلاشباگ، خەیاڵ، خەون و هەرچی شێوازێکی تری هەستەکانە بە هیی شەشەمیشەوە.

شاکەس؛ پێویستە هەندێ سیفەتی تایبەتی تێدا بێت تا بیکاتە خاوەنی ئەو شایستەییەی ببێت بە کارەکتەری سەرەکیی ڕۆمانێک. وەک چۆن لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤدا هەموو کەسێک نابێتە جێگەی بایەخ و کەسایەتیی تایبەت، ئاواهییش لە ڕۆماندا، بۆ ئەوەی کەسێک شاکەسی ڕۆمانەکە بێت، پێویستە خاوەنی چەندین مەرج و سیفەتی کەسایەتیی جیاهەڵکەوتوو بێت تا شایانی ئەوە بێت ببێتە جێگەی بایەخ و سەرنج ڕابکێشێت.

دژەکانی شاکەس؛ ئەمانەش دەشێ کەسانی تر بن و پێویستە مەرج و هۆکاری تایبەتییان هەبێت بیانکات بە دوژمن و نەیاری شاکەس، ئەگەر کەش و بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری بێت، دیسانەوە بە هۆکاری تایبەت ئەم دۆخە دروست دەبێت کە دژایەتیی شاکەسی ڕۆمانەکە بکەن.

کارەکتەرە ماماناوەندی و لاوەکییەکان لە ڕۆماندا نابێت بەخۆڕا لەوێ بن و بەبێ ئەرک و بێمەبەست دانرابن، پێویستە هەریەکە و بۆ مەبەستی دیاریکراوی خۆی لەوێ بێت و ئەرکی پێ سپێررابێت.

شوێن و کات گرنگیی خۆیان هەیە و جوگرافیا و مێژووی ئەو نیشتیمانەن کە ڕۆماننووس یان خۆی دەیانخوڵقێنێت، یانیش لە واقعەوە دەیانهێنێت.

با بزانین ئەحلام مەنسوور چۆن لە ڕووی هونەر و داب و نەریتی ڕۆماننووسینەوە ڕۆمانی ئەڵوەنی بونیاد ناوە؟

لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆمانی ئەڵوەنەوە و هەر لە دوو دێڕی یەکەم و دووەمیەوە گێڕەرەوەکەی دەناسین و بەوەدا کە خەریکی گەڕانە بە نێو کتێبخانەکەیدا و هەموو کتێب و دەفتەر و گۆڤارەکانی ئەمسەر و ئەوسەر پێ دەکات، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە

---
١ ل ١٥، تەکنیکی گێڕانەوە، ڕێزان ڕەحمان خدر.

ڕۆشنبیرە و بە گومانی زۆریش نووسەریکە، کە دەشێ گێڕەرەوە هەر خودی نووسەر بێت. لە دێڕی سێیەمیدا بە هۆی ئەو وێنە کۆنەوە کە لە یەکێک لە کتێبەکانەوە دەکەوێتە خوارەوە کە وێنەی ژنێکە دەستی منداڵێکی هەشت ساڵانی گرتووە و ئەو منداڵەش گێڕەرەوەی ڕۆمانەکەیە، وێنەکە پێش بیستوچوار ساڵ گیراوە و ئەو وێنەیە دەیخاتە نێو دۆخی بیرهاتنەوەی ڕووداوگەلێکی کۆن کە لە شارێکدا و بە تایبەتیش لە گەڕەکەکەی ئەواندا ڕووی داوە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە گێڕەرەوە و شاکەس هەردووکیان ئافرەتن، ئافرەتی ناو وێنەکە کە (ئامە ڕەش)ی ناوە و دایەنی منداڵەکە بووە. کەشی دەستپێک گومانی ئەوەش دروست دەکات کە نووسەر خۆی گێڕەرەوە بێت، چون زێدی گێڕەرەوە و نووسەریش هەمان شوێنی ڕووداوەکانی نێو ڕۆمانەکەیە کە شارۆچکەی خانەقینە.

### دەروازەی ئەڵوەن

لاپەڕەکانی سەرەتای ڕۆمانێک زۆر گرنگن و ڕۆماننووسی سەرکەوتوو ئەو مەرجانەی تیا ڕەچاو دەکات کە خوێنەر بە تێکستەکەیەوە وابەستە بکات. گێڕەرەوەی ڕۆمانەکە یان نووسەرەکەی، دەیەوێت خوێنەر گیرۆدەی خۆی بکات و تا دوادێڕ ئامادە بێت بە سوپاسەوە هاوهەنگاوی بێت. دەستپێکی ڕۆمانی ئەڵوەن و پەرەگرفەکانی سەرەتای هێندە سەرنجڕاکێش و زانیارییەخشن، بە تایبەت لەبارەی شاکەسی ڕۆمانەکەوە، هەر لەو سەرەتایەوە خوێنەر بە کەسایەتییەکی نائاسایی ئاشنا دەکات کە چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکرێت ڕووداوخوڵقێن بێت و ڕووداوەکانیش سادە نەبن. ئەو زانیارییانەی کە گێڕەرەوە لەبارەی شاکەسەوە لە لاپەڕەی یەکەمەوە دەیانخاتە ڕوو، زۆر وردن و هەندێکیان لەبارەی شێوەی و هەندێکی تریش لەبارەی ناوەڕۆکی یان سیفەتی کەسایەتیی شاکەسەوەیە و بە هەردوو بارەکەدا کەسێکی نائاسایی و سەرنجڕاکێشمان پێ دەناسێنێت. بڕوانە ئەم سیفەتانە:

(ئامە ڕەشی دایەنم بە میراتی لە باوکیەوە خووی تلیاککێشانی بۆ مابووەوە... ڕەنگە تاقە میراتییەک لەباتیی موڵک و ماڵ و... ئەم خووەی بۆ بەجێ هێشتبێت.) ل ٥.

(بەرگێکی ڕەشی هەمیشەیی وەک پێست نووسابوو بە لەشیەوە، ملیۆنێ گۆڕان لە ساتێکی مەستیدا لە ڕوخساریدا دەردەکەوت.) ل ٦.

(دەموچاوێکی خڕ، گۆشتن، دوو گلێنەی قاوەیی لە ناو سپێنە زەردهەڵگەڕاوەکانیدا مەلەوانییان دەکرد، برژانگەکانی وەک فلچەیەکی زۆربەکارهێنراو و سواوی هونەرمەندێک، تەڵەکانی کورت کورت و هەڵوەریو بوون.) ل ٧.

(نازانم چۆن باسی ملی بکەم، ئەگەر بڵێم ملیی نەبوو، ئەوا!!!!) (قەڵەو، دەنگناسک،، سنگی بەرز و چوارشانە بوو، مەمکەکانی زۆر گەورە بوون، ئەگەر لەسەر خۆیشی بڕۆشتایە، هەر دەلەرانەوە...) ل ٧.

هەر لە دەستپێکەوە چاوەڕوانی کردارگەلی نائاسایی لە گێڕەرەوەش دەکەین، چونکە پەروەردەی دەستی ژنێکی تلیاککێشە کە دایەنی بووە و زۆرینەی کاتەکانی منداڵیی لەگەڵ ئەودا بەسەر بردووە، ئەگەرچی خۆی دایکێکی ئاسایی هەبووە. سەبارەت بە دایەنەکەی دەڵێت: (منیش وەک کووچکووچە دەکەوتمە دوای و کۆڵان بە کۆڵان لەگەڵیدا دەسووڕامەوە.) ل ٦. بەم ڕستەیە خوێنەر وا لێ دەکات بە تەواوی باوەڕ بە گێڕانەوەکانی بکات، چونکە لەگەڵ شاکەسدا هەنگاو بە هەنگاو هەڵسوکەوتی کردووە و ئاگاداری تەواوی نهێنییەکانی ژیانیەتی. (بە شیری ئامە ڕەش پەروەردە بووم، کاتێکیش تەمەنم گەیشتە هەشت ساڵ، هەموو ڕۆژێ پێی دەوتم: بچوو ڕووڵە، ها بگرە ئەیە دوو عانە، بچوو ئەرا بازاڕ بێژە حەسەن تووتنچی دوو عانە جغارە ئارام بنێرد، زوی بچوو ئیسە دووکانەگەی وەسد و چەدماڵ، ئارامی بڕیاس، ئەگەر قسەش کرد گوش مەتەکن،

ئەحلام مەنسوور

زوی بەوە دویاوە.) ل ٧. ئەمەیان یەکەمین گفتوگۆی نێو ڕۆمانەکەیە و بە شێوەزاری کوردی دەڤۆکی خانەقین دەیگێڕێتەوە، ئەمەش لە لایەکەوە ڕادەی باوەڕپێکردن لای خوێنەر زۆر بڵند دەکاتەوە و لە لایەکی تریشەوە خوێنەر وا لێ دەکات چاوەڕوانی ئەوە بێت تەواوی ئەو گفتوگۆیانەی داهاتووش بەو شێوەزارە بن.

## ناسنامەی گێڕەرەوە

لە ڕۆماندا گێڕەرەوە زۆر گرنگە کارەکتەرێکی جیاواز، جێی متمانە و زۆرزان بێت و پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ شاکەس و ڕووداوەکاندا هەبێت. چەندین شێواز و تەکنیکی گێڕانەوە هەیە و نووسەر هەوڵی ئەوە دەدات شێوازێکی تایبەت بە خۆی و تا ڕادەیەک جیاواز لە نووسەری تر هەڵبژێرێت. لە ئەلوەندا گێڕەرەوە منداڵە هەشت ساڵییەکەی ناو وێنەکەیە کە لە کتێبەکە کەوتە خوارەوە و لە ئەنجامی گفتوگۆیەکی سەرەتاوە بۆمان دەردەکەوێت ناوی لەیلایە و لە وێنەکەدا هەشت ساڵە و لە کاتی دۆزینەوەی وێنەکەدا تەمەنی سیوچوار ساڵە. کەواتە شێوازی گێڕانەوەکە ڕاستەوخۆ نییە، بەڵکو لە شێوەی شەپۆلی هۆش و گەڕانەوە بۆ سەردەمی زووتر لە ڕێگەی وەبیرهێنەرەوەیەک، کە وێنەکەیە. ئامرازەکانی هونەری سینەما فلاشباک و شەپۆلی هۆش (Stream of Consciousness) و خەونبینین، دیالۆگی ناوەکی و مۆنۆلۆگ لەو تەکنیکانەن پەنایان بۆ براوە، بۆ ئەنجامدانی گێڕانەوە.

لە ڕۆمانی هونەریدا چەند جۆرێ گێڕەرەوە و چەند جۆرێکی گۆشەنیگا یان بینین (point of view) هەن. گێڕەرەوە هەیە ئەوەندەی شاکەس دەزانێت و بینینەکەی سنووردارە، هەیە کەمتر لە شاکەس دەزانێت و دیسانەوە بینینەکەی سنووردارە، لەو دۆخانەدا ڕۆماننووس زیاتر لە دەنگێک بەکار دەبات بۆ گێڕانەوەی تەواوی ڕووداوەکان. لە ڕۆمانی ڕۆژئاواییدا فرەدەنگی وەک تەکنیکێکی گێڕانەوە بەکارهێنانێکی بەرفراوانی هەیە. هەشە زۆرتر لە شاکەس و لە کەسە مامناوەندییەکانیش دەزانێت و دەسەڵاتی بەسەر تەواوی ڕووداوەکاندا هەیە و بینینەکەی بێسنوورە، واتە هەموو شت دەبینێت و لە دواوەی هەموو ڕووداوەکانەوە ڕاوەستاوە و وێنەی گرتوون و پیشانیان دەدات. ئەو جۆرەش پێی دەگوترێت "گێڕەرەوەی هەموشتزان". وەک ستایلی گێڕانەوەش بەپێی تۆماشڤسکی کە ڕەخنەگرێکی فۆرمالیستی ڕووسییە، دوو جۆر هەیە، کە یەکەمیان بابەتی و دووەمیان خودییە. لە جۆری بابەتیدا گێڕەرەوە یان نووسەر ئاگاداری هەموو شتێکە، تەنانەت بیرکردنەوە و خەیاڵ و باری دەروونیی کارەکتەرەکانیش، لە جۆری خودیدا مەرج نییە گێڕەرەوە هەموو شت لەبارەی

کەسایەتییەکانەوە بزانێت.٢
لەیلا لەم ڕۆمانەدا "گێڕەرەوەی هەموشتزانە"؛ ستایلی بابەتی لە گێڕانەوەدا بەکار دەبات و بە ڕاناوی کەسی یەکەمی لکاو ئەو ڕووداوانە دەگێڕێتەوە کە خۆی تێیاندا ڕاستەوخۆ بەشدارە؛ ئەوانەشی سەبارەت بە شاکەس (ئامە ڕەش) و کارەکتەرە مامناوەندییەکانی ترن و ناڕاستەوخۆ ئاگاداریانە، بە ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک (ئەو) دەیانگێڕێتەوە. نموونەی هاتنەگۆ بە ڕاناوی کەسی یەکەم (من):
(هەموو ڕۆژێ سەرلەبەیانی، بە پێی پەتی ڕام دەکرد و دەچوومە لای حەسەن تووتنچی.) ل٨.
نموونەی باسکردن بە ڕاناوی کەسی سێیەم (ئەو):
(گەلێ جار دەمبینی بە کزی دانیشتووە و دوو عانەکەیشی نییە، هەر کە بەم شێوەیە دەمبینی، لە سێ عانە لە خەرجییەکەی خۆم، بێ ئەوەی پێم بڵێ، دەچووم جغارەکەم بۆ دەکڕی، لە بنی باخەڵەمدا دەمشاردەوە، هەر کە چاوی پێم دەکەوت، دەیوت: پاد سوزیایە، دایگد نەکوشتەد؟ نەووت ئەرا وەپای پەتی چیدەسە دەشت؟) ل ١٠.
لە ڕۆمانی ئەڵوەندا گێڕەرەوە دوو جۆر زمان بەکار دەبات، زمانی گەورەیی، کە کوردییەکی سۆرانیی ستانداردە، زمانی منداڵی، کە شێوەزاری کەڵهوڕییە کە دانیشتوانی خانەقین و هەندێ ناوچەی دەوروبەری پێ دەدوێن. هەندێ دێڕ و گفتوگۆشی تێدایە بە تورکمانییە و لە پەراوێزدا ماناکەی کراوە بە کوردی. ئەم ئاڵوگۆڕە لە زمانی گێڕانەوە و گفتوگۆکاندا دەری دەخات گێڕەرەوە گەر خودی نووسەریش نەبێت، ئەحلام مەنسوور یادگەی خۆی پێ بەخشیوە و ئازادی کردووە بە شێوازی ئەو بچێتە ناو کووچە و کۆڵانەکانی خانەقینەوە و ڕووداوەکان بەوپەڕی سەلیقەوە بگێڕێتەوە. "گێڕانەوە نابێت بە ڕۆمان، تا بە زمان بەرجەستە نەکرێت، جا ڕووداوەکان خەیاڵی بن یان ڕاستی."٣

### چنینی چیرۆک لە ئەڵوەندا

چنینی چیرۆکی سەرەکی (Plot) لە ڕۆماندا شتێکی ئاسان و سادە نییە، تەکنیکی خۆی هەیە و تاکتیکی نووسەرانەی پێویستە بۆ ئەوەی گرێ بە گرێ و هەنگاو بە هەنگاو ڕووداوەکان بناسێنرێن (Exposition)، ئینجا هێدی هێدی ڕووداوەکان هەڵبکشێن (Complications) و بگەنە لوتکە (Climax) و دواتریش هێدی هێدی دابکشێن و ئەنجام (Resolution) بە دەستەوە بدەن و کۆتاییەکی داخراو یان کراوەیان بۆ دروست بکرێت.٤
شاکەس (پرۆتاگۆنیست-protagonist) لە ڕۆماندا پێویستە بەرهەڵستکار (ئەنتاگۆنیست-antagonist)ی هەبێت، چەندین هاودژی هەبێت کە سیفەتەکانیان پێچەوانەی ئەو بێت، ئەم ئامانجێکی هەبێت بۆی تێبکۆشێ و دژەکانی بەربەستی بۆ دروست بکەن و بەرهەڵستیی هەنگاوەکانی بکەن. دژەکان، کەسی ئاسایی یان نائاسایی بن، دەشێ بەرهەڵستکاری شاکەس بارودۆخی ئابووری بێت، یان کۆمەڵایەتی و کولتووری یان ژینگە و سروشت دژایەتیی بکەن، گرنگ ئەوەیە چەندین وێستگەی گرنگ هەبێت ڕێ لە شاکەس بگرێت بگات بە ئامانج، یان کێشە و بەربەستی گەورە و مەترسیداری بۆ دروست بکات.
ئەحلام مەنسوور لە چنینی چیرۆکی سەرەکیی ئەڵوەندا شارەزایانە ئەم کارانەی کردووە. ئامە ڕەش شاکەسە و ژنێکە چەندین سیفەتی کەسێتیی دژبەیەکی هەیە، تلیاکێشە، بەڵام هاوکات ژنێکی هەقخواز و هەقبێژە، لە کاتی بەنگکێشاندا ئاڵوودە و مەستە، بەڵام چاونەترس و قسەلەڕوویشە و جێی باوەڕی زۆرینەی ژنانی خانەقینە و نهێنیی تەواوی خەڵکەکەی لایە، بە تایبەت ئافرەتانی بەرزەبروزەنگکەوتوو، چەوساوە و زەوتکراو و

---
٢ توماشفسکی، ل ١٣٢
٣ سرد الاخر، ل٤٥
٤ Drama, Exploring Literature, P 71.

ئەحلام مەنسوور

ئەتککراوی گەڕەکەکە و شارەکە. تەنانەت هەندێ لە پیاوەکانیش متمانەی پێ دەکەن و نهێنیی خۆیانی لا باس دەکەن. ئامە مێرد بۆ بێوەژنان دەدۆزێتەوە و ژن بۆ پیاوانی ژنمردوو دەدۆزێتەوە. پەردەی کچانی دەستدرێژیلێکراو چاک دەکاتەوە و زۆڵەکانیان لەبار دەبات، یان بە نهێنییەوە دەبێتە مامانیان و دواتر کۆرپەکانیان دەداتە ئەو ماڵانەی کە منداڵیان نابێت. لەو شارەدا چەندین کوڕوکچی ناسنامەون هەن و تەنها ئامە ڕەش دەزانێ کێ منداڵی کێیە و کێ منداڵی کێ نییە. بە هۆی ئەم سیفەتانەوە، ئامە ڕەش دۆست و دوژمنی زۆرە، ئەوانەی بۆ چارەسەری کێشەکانیان ڕوو لە ئامە دەکەن، خۆشیان دەوێ، بە تایبەتی ژنان، بەڵام ژنانێکیش ڕقیان لە ئامەیە و دەترسن ژن بۆ مێردەکانیان بێنێت. پیاوانێ خۆشیان دەوێت و داوای لێ دەکەن بە دولبەرەکانیان بگەیەنێت، پیاوانێکیش ڕقیان لێیەتی، چونکە نهێنیی تاوانەکانیان دەزانێ، بە تایبەتی کە تاوانی دەستدرێژیکردنەسەر ژنانە و پەیوەندیدارە بەو منداڵانەی کە لە پەیوەندییە نادروستەکانیانەوە دروست بوون. ئەم دۆخانە ململانێخولقێنن و لە بەرژەوەندیی ڕۆمانەکەدا وەک ئەنتاگۆنیست دژایەتیی شاکەس (پرۆتاگۆنیست) دەکەن.

## کات و شوێن لە ڕۆمانی ئەڵوەندا

ڕۆمان خۆی بە تەنها نیشتیمانێکی پڕ لە هاووڵاتییە، نووسەر دەیخوڵقێنێت. نیشتیمانیش پێویستە مێژووی هەبێت و جوگرافیای هەبێت. ڕۆمان چونکە تەرکیز دەکاتە سەر هەندێ لە ڕووداوەکانی ئەو نیشتیمانە، بۆیە جوگرافیا و مێژووەکەشی دیاریکراو دەبێت. واتە شوێن و کات لە ڕۆماندا پێویستە دیار بن و سنوورەکانیان بناسرێت. ناوی ڕۆمانەکە ئەڵوەنە، لەمەوە جوگرافیای ڕۆمانەکە بەبێ خوێندنەوەشی دەزانرێت و دەناسرێتەوە کە خانەقینە. پانتایی ناوەندی شاری خانەقین و دەوروبەرەکەی ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانەیان لە خۆیان گرتووە، بەڵام چڕبوونەوەی سەرنج لەسەر گەڕەکێکە کە لەیلا و ئامە ڕەشی تێدا ژیاوە و ماڵ بە ماڵی ئەو گەڕەکە بە ژن و پیاوەوە، بە کچ و کوڕەوە، خاوەنی چەندین ڕووداون و کارەکتەرەکانیان پێکەوە لە پەیوەندی و ململانێدان و لە شێوەی چیرۆکی لاوەکی و پەیوەندیدار بە تەوەری سەرەکیی چیرۆکەکەوە کە بە دەوری شاکەسدا دەسووڕێنەوە، چنراون.

کات: پەنجاکانی سەدەی بیستەمە. کەشی ڕۆمانەکە و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و بارودۆخی دەروونیی کارەکتەرەکان و گفتوگۆ ناوەکی و دەرەکییەکان، قۆناغی دەرەبەگایەتیی کۆمەڵگەی کوردستان دەردەبڕن؛ لە ڕێگەی کارەکتەری حەسەن ئاغا و ڕەفتارەکانییەوە دەخرێتە ڕوو. ئاغا بە تەواوی دەسەڵاتی خۆسەپێنەرانەی دەردەکەوێت و چەندین ئافرەت ئەتک دەکات و چەندین پیاو ناچار دەکات قوربانییەکانی دەستی مارە بکەن و ئەو منداڵانە بەخێو بکەن کە لە تۆوی ئاغا دروست بوون و ددانیان پێدا نانێت. لە قوربانییەکانی ئاغا هەن خۆیان دەکوژن و هەن دەکوژرێن. لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا باسی شۆڕشی ١٤ی تەمووز دەکرێت کە کۆتایی بە دەسەڵاتی ئاغاکان دێنێ و زەوی بەسەر جووتیاراندا دابەش دەکات، ئەمەش وا دەگەیەنێت کاتی ڕۆمانەکە لە سەرەتای دەیەی پەنجای سەدەی بیست دەست پێ دەکات و تا کۆتایی ئەو دەیەیە بەردەوامە.

## کێشەکانی ناو ئەڵوەن

لە ڕۆمانی ئەڵوەندا کێشەکان بە سێ جۆر دەردەکەون:

یەکەم: کێشەی چینایەتی، ململانێی نێوان هەژار و دەوڵەمەند، ئاغا و بندەستەکانیەتی.

دووەم: کێشەی جێندەری، ململانێی نێوان پیاو و ژن.

سێیەم: کێشەی کولتووری، ململانیی نێوان ڕۆشنبیر و ناڕۆشنبیر، ململانێی نەوەکان لە نێوان کچ و دایک و کوڕ و باوک، کێشەی نێوان باوەڕدار و بێباوەڕ، مەزهەبی و نامەزهەبی.

سەبارەت بە کێشەی چینایەتی، نووسەر لە ڕێگەی وەسفی کارەکتەرەکان و هەڵسوکەوت و گفتوگۆکانیانەوە، وەک وێنەکێشێکی دەروونناس بە وردی ململانێ ناوەکی و دەرەکییەکانی وێنە کێشاوە. لە دیمەنێکی چوونە قەبرستانی نەجەف و زیارەتکردنی ئیمامەکان، بە جوانی کێشەی باوەڕداری و مەزهەبی وێنە کێشاوە، بەڵام کێشەی جێندەری لە ناو ڕۆمانەکەدا زەقترین و

بەرجەستەترینە و دەتوانین لە ناو هەموو ڕووداوەکاندا هەستی پێ بکەین. بەپێی ئەوەی هەردوو گێڕەرەوە و شاکەس ئافرەتن و هەردووکیان باوەڕیان بە ئایین و ئەفسانەکان نییە و هەقبێژ و هەقخوازن، بە شێوەیەک کێشەکان خراونەتە ڕوو کە دیدگایەکی فێمینیستانەی تیا هەست پێ دەکرێت کە نێری دەسەڵاتسەپێن وەک بوونەوەرێکی نائاسایی بخاتە ڕوو کە ناهەقی دەکات و دەچەوسێنێتەوە، چەوسێنراوەکانیش یان دایک یان هاوسەر یان دولبەر و یان کچانی بەرزەبرکەوتوو و ئەتککراون. چەوسێنەرەکان و چەوساوەکان لەم ڕۆمانەدا هەردووکیان بە مەبەستەوە لە لایەن نووسەرەوە وەک دۆخی نائاسایی خراونەتە ڕوو، لە میانەی کۆمێنتەکانی گێڕەرەوە لە دۆخی گەورەییدا، واتە نووسەر خۆی، بیروبڕوایەکی دژبوون بەو نادادپەروەرییە و ناڕازیبوون بەو دۆخە، بە بەرجەستەیی دیارە، بەڵام ئەم ناڕازیبوونە لە شێوەی دروشمی زەقدا دەرنەبڕراون، بەڵکو سیمبولئامیزانە بە زمانێکی هونەری وەک ئاماژەی پەیامئامێز هەستیان پێ دەکرێت. "ڕۆمانی نوێ، دەیەوێ گوزارشت لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بکات، یان هەوڵ دەدات لە دروستکردنی پەیوەندیی نوێدا بەشدار بێت، ئەمەش لە هۆشیارییەکی جوانیناسانەوە هەڵدەقوڵێێ کە سنووری هۆشیاریی ئاسایی تێدەپەڕێنێت و دەیگەیەنێتە ئاسۆی نوێ، بۆیە ئەرکی ڕۆمانی نوێ ئەوە نییە وەعز و تەلقین و ڕێنمایی بدات، بەڵکو بەرجەستەکردنی ڕوانینێکی هونەرییە، واتە لێکدانەوەیەکی هونەرییە بۆ جیهان، هەروەها بینین و دۆزینەوەی نوێیە بۆ پەیوەندییە شاراوەکان کە لە میانەی ئەم دۆزینەوانەوە چێژ دەخولقێت و ڕاکێشان و تامەزرۆیی دروست دەبێت."[5]

## باکگراوندی پەروەردەیی کارەکتەرەکان

یەکێک لە سەیرترین شتی ڕۆمانی ئەڵوەن جنێوەکانە کە کارەکتەرە جۆربەجۆرەکان بە یەکتری دەدەن و لە ڕێگەی ئەو جنێوانەوە باکگراوندی ڕۆشنبیری و پەروەردەیی کەسەکانی نێو ئەو ڕۆمانە و ئەو سەردەمە مێژووییەشمان

---

٥ انماط الرواية، ص ١٤

بۆ دەردەکەوێت کە پەنجاکانی سەدەی ڕابوردووە. نووسەری ئەم ڕۆمانە زۆر بوێرانە و بەبێ ئەوەی یەک زەرە سانسۆر لەسەر پیسترین جنێو کە ژنەکان لە شەڕی ناو گەڕەکدا بە یەکتری دەدەن، یان پیاوەکان بە ژنەکانی دەدەن یان پیاوەکان بە یەکتری دەدەن، وەک خۆی نووسیونی، بۆیە دیمەنەکانی شەڕەکان بە بەرجەستەیی دەکەوێتە پێشچاوی خوێنەر و باوەڕپێکردنی خوێنەر بە گێڕەرەوە زیاد دەکات، چونکە هەموو خوێنەرێک دەزانێت جنێو بەشێکە لە کولتووری هەموو نەتەوەیەک و وەک چۆن لە واقعی کۆمەڵایەتیی ژیانی ئاساییدا هەیە، پێویستە لە واقیعی کۆمەڵایەتیی ژیانی کەسەکانی ناو ڕۆمانیشدا هەبن. بۆ نموونە، ئەم گفتوگۆ جنێوئامێزانە کە مشتێکی خەروارەکەن:

(کچێ هەی کوسوو، هەی گاندەر تۆ لەگەڵ کێدا شەڕ دەکەی ها؟ هەی قەحپە ئەگەر نازانی من تاوس خانی کچی عەبدوڵا خانی جوانڕۆم. تاوس خان نەبم گەر ڕسوات نەکەم، تاوس خان نەبم گەر تەرفتوێند نەکەم، گەر تاوس خان بم دەبێ شەواڵەگەد بکەمە عەلەم، تاووس خان نەبم ئیلا کوسد درنم..) ل ٢١.

(گەواد ژنەگەم لە قاپی دەرنێچدە دەشت وەعەبا نوود، توو لە کورە دیدەی؟ چوین چاوود کەفتە پی؟) ل ٣٦.

(توش ڕەحمانی فاتە قەرە هەی حیز، هەی هەی خوێڕی، خۆ هەموو شار دەتناسن.) ل ١٧.

پەند و ئیدیۆم و هەندێ دێڕی گۆرانیی فۆلکلۆریی ناوچەی خانەقین زۆر وەستایانە و لە جێی مەبەست دانراون و هەندێکیان بە زمانی تورکمانین. نووسەر مەبەستی بووە پێمان بڵێت خانەقین شارێکی فرەکولتوور و فرەزمان و فرەمەزهەبە. بۆ ئەوەی بە جوانی و وردی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و ئاستی هۆشیاریی کۆمەڵگەی ناو ڕۆمانەکە دەربرێت، خوازبێنی و شایی، پرسە و چوونەسەرقەبران، مەراسیمی منداڵبوون و ناولێنان و چوونەحەج، چوونەمزگەوت، چوونەحەمامی ژنان و هتدی لە ڕۆمانەکەدا دروست کردووە کە لە هەموویاندا ڕووداو دەخولقێنێ و لە میانەیانەوە لایەنی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی کەسەکان پیشان دەدات.

## کۆژانی ژن لە ئەڵوەندا

نووسەری ڕۆمانی ئەڵوەن بە مەبەستەوە دەیان چیرۆکی لاوەکیی لە دەوروبەری چیرۆکە سەرەکییەکەوە چنیوە و لە هەمووشیاندا ژانی ژنێک دەردەبڕێت کە ستەمی جۆراوجۆری لێ کراوە. لە نێو ئەوانەدا کچ هەیە دایکی ستەمی لێ دەکات، کچ هەیە منداڵانی کۆمەڵان ستەمی لێ دەکەن، ژن هەیە کارەکەرە و خاوەنماڵە دەوڵەمەندەکەی ستەمی لێ دەکات و دەستدرێژیی دەکاتە سەر، ژن هەیە لەبەر نەداری ستەمی جۆراوجۆری لێ دەکرێت، ژن هەیە لەبەر ناچاری دەبێتە لەشفرۆش، ژن هەیە لەبەر ئەوەی بە زۆر بە مێردێکی پیر دراوە، پەیوەندیی نهێنی لەگەڵ پیاوی تر دەبەسێت و لە ئەنجامدا بە دەستی پیاوەکەی دەکوژرێت، ژن هەیە بە دەستی کوڕەکەی دەکوژرێت، ئیتر دەیان چیرۆکی لاوەکی تێهەڵکێشێکی هونەریی جوانیان بۆ کراوە و مەبەستیش لێیان بەرجەستەکردنی کۆژانی ژنانە. دەتوانین بە دڵنیاییەوە بێژین کە خودی مەبەستی سەرەکی لە نووسینی ڕۆمانی ئەڵوەندا گەیاندنی ئەم ژانە و پەیامی یەکسانیخوازانەیە. ئامە ڕەش وەک شاکەسی ڕۆمانەکە پشتگیریی هەموو ژنانی ستەملێکراو دەکات و هاوکارییان دەکات بۆ ئەوەی لە کێشەکانیان ڕزگاریان بکات. ئەم کارە بۆ هەندێکیان سەردەگرێ و لە مردن و کوشتن ڕزگاریان دەبێت، بەڵام بۆ هەندێکیان سەرناگرێ و ئەنجامیان بە کوشتن و تراژیدیا کۆتایی دێت. لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا ئامە ڕەشی شاکەس، خۆیشی دەبێتە قوربانییەکی تری دەستی پیاوێک کە خۆیشی قوربانییەکی دەستی زۆردارێکە. مچە کە کوڕی دادانپیانراوی حەسەن ئاغایە، ئامە دەکوژێت.

## پەیامی شیعرئامێزی ڕۆمانی ئەڵوەن

لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا گێڕەرەوە دەگەڕێتەوە سەر وێنەکەی کە تەماشای دەکرد و بە هۆیەوە هەموو چیرۆک و ڕووداوەکانی بە یاد هاتەوە کە بە کوشتنی ئامە کۆتایی هات. وێنەکە دەدڕێنێ و شیعرێک بۆ ئامە ڕەش دەنووسێت کە لە نێو ئەو شیعرەدا تەواوی کۆژانی ژن و پەیامی ڕۆمانەکە

بەرجەستە دەکات. شیعرەکە درێژە، لە چەند دێڕێکیدا بەم شێوەیە پەیامەکە دەخاتە ڕوو:

ئامە

ئامە مردی

بۆ دواجار چاوەکانت لەیەک نا و ماڵئاواییت کرد

ئەو جووتە چاوانەی

هەمیشە ئارامگای منداڵانی زۆڵ و ئاوارە و بێوەژنان و دەربەدەر و کڵۆڵان بوون..

ئەو چاوانەی بێئارام و بێئۆقرە بوون

ئەو چاوانەی فرمێسکەکانی بووبوونە دەرمان و

تەنیا برینی هەژارانی سارێژ دەکرد

ئارام و دڵنەوایی پێ دەبەخشین

هێز و توانای باوەڕبەخۆهێنان و سەرکەوتنیانی پێ دەبەخشین...

....

بەهەشتی دڵت

هەزاران هەزار داری خەمی تیا ڕوابوو

دڵت بەهەشتی هەژاران بوو

ئاوارە و دەربەدەر

بێوەژن و کچی هەڵخەڵەتاو

ئامە دەتویست

خوێنی دڵت بکەی بەو ئاوە

ئە فسو نا و ییە ی

تاوانی تاوانباران بشواتەوە

گوناهی گوناهباران ڕاستکاتەوە

هەموو دز و درۆزن و جەردە و قاچاخچی

هەموو فێڵباز و خوێنمژ و ئاغا و دەرەبەگەکانیش

بەو خوێنە پیرۆزەی دڵت ڕێگەی ڕاست بگرن و لە خراپەکانیان دووریان بخەیتەوە

لە کۆتاییی کۆتاییدا گێڕەرەوە کە دەکاتە نووسەر خۆی، لەوپەڕی بێئومێدیدا شیعرەکەش دەدڕێنێت و وەک وێنەکە فڕێی دەدات و پەنا دەباتە بەر حەبێکی ئارامبەخش بۆ ئەوەی خەوی لێبکەوێت. ئەمەش وەک نارەزاییەک بەرامبەر بە کۆژانی ژنان، بەرامبەر نادادپەروەریی کۆمەڵ و بەرامبەر بەردەوامیی ستەم. دەشکرێت وا لێک بدرێتەوە کە مەبەستی درێژەدان بێت بە خەباتی هەقخوازانەی ڕۆژانەی ژیانی ئامە ڕەش، بەوەی ئەو خووگرتوو بە تلیاک بوو، ئەم خووگرتووە بە حەبی ئارامبەخش.

**دەرەنجام:**

لە وەڵامی ئەو سێ پرسیارەی کە لە سەرەتای لێکۆڵینەوەکەدا کردمان و لە سۆنگەی تاوتوێی ڕۆمانەکە بە وردی، دەتوانین ئەم خاڵانە وەک ئەنجام بخەینە ڕوو:

یەکەم: ئەحلام مەنسوور لە ڕۆمانی ئەڵوەندا، پەیڕەوی داب و نەریتی ڕۆماننووسینی بە تەواوی شارەزاییەوە کردووە. ئەگەرچی ئەڵوەن ئەچێتە خانەی ڕۆمانێکی ڕیالیستی کۆمەڵایەتییەوە بەڵام فەنتازیای ڕۆماننووس کارا و سەرنجڕاکێشانە چیرۆکەکەی چنیوە، گرێگەلی دروست کردووە، وەستایانە ڕووداوەکانی هەڵکشاندووە و بەدەم سەرسامکردنی خوێنەرەوە کێشەکانی تا چڵەپۆپە بردووە و هێدی هێدی داکشاوە و کۆتاییەکی تراژیدیی بۆ دروست کردووە.

دووەم: کێشەکانی جێندەر لە یەکەم وشە تا کۆتاوشەی ڕۆمانی ئەڵوەن بەرجەستە کراون و بە دیدگایەکی ڕۆشنفکرانەی فێمینیستانە ڕووداوەکان لە لایەن گێڕەرەوە و شاکەسەوە خراونەتە ڕوو. هەردووکیان بە شێوازی خۆیان وەک تێکۆشەری ڕێگەی دادپەروەری و یەکسانی کۆشش دەکەن. شاکەس ئەگەرچی لەو تێکۆشانەدا دەبێتە قوربانی، بەڵام لە پەیامی ڕۆمانەکەدا کە شیعرێکە، بە زیندوێتی دەمێنێتەوە. گێڕەرەوەش ئەگەرچی لە کۆتاییدا نائومێدانە پەنا دەباتە بەر دەرمانی خەو بۆ ئەوەی لەو واقیعە دای ببڕێت، بەڵام ئەوەشیان وەک جۆرێک نارەزایەتی لەو نادادپەروەرییە تۆمار دەکات.

سێیەم: ئەحلام مەنسوور، وەک ئەوەی لە کەسێتیی خۆیدا ژنێکی بوێر بووە و لە نووسینەکانیدا بێدەربەستانە و ئازادانە ڕای خۆی دەربڕیوە، لەم ڕۆمانەشدا مەبەستی بووە هاندەری بوێری و چاونەترسیی ژنان بێت چ لە ژیان و

چ لە نووسیندا. هەڵبژاردنی کارەکتەرێکی وەک ئامە هەقبێژ و هەقخواز، نەترس و تێکۆشەر، هەروەها هەڵبژاردنی گێڕەرەوەیەک کە بە تەواوی ئازادییەوە هەموو نەوتراوەکان دەڵێت و نهێنییەکان ئاشکرا دەکات، مەبەستیەتی ژن هان بدات خۆیان دەربڕن و سڵ لە هیچ نەکەنەوە.

## سەرچاوەکان

ئەحلام مەنسوور، ئەڵوەن، ڕۆمان، دەزگای چاپ و پەخشی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.
ڕێزان ڕەحمان خدر، تەکنیکی گێڕانەوە، یەکێتیی نووسەرانی کورد، هەولێر، ٢٠١٢.
توماشفسکی، نظریة المنهج الشکلی، ترجمة، ابراهیم الخطیب، موسسة الابحاث العربیة، بیروت، ١٩٨٢.
صلاح صالح، سرد الاخر، الانا و الاخر عبر اللغة السردیة، المرکز الثقافی العربی، بیروت، ٢٠٠٣.
د. شکری عزیز الماضی- انماط الروایة – عالم المعرفە- ٢٠٠٨.
Drama, Exploring literature, Sabis book Series, ٢٠١٠.
Novel, Exploring literature, Sabis book Series, ٢٠١٠.

# گرنگیی ئەدەبی فێمینیستیی کۆمۆنیستیی یاخی لە کۆمەڵگەی داخراودا

**د. کارزان عەبدولرەحمان موراد**

داخراویی هەر کۆمەڵگەیەک دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەک، کە نەک لە خۆیەوە دروست بووبێت، بەڵکو چەند هۆیەکی هەیە. ئەگەر بە درێژایی مێژوو سەیری ئەم بابەتە بکەین، بنەماکەی هەر لەو کاتەوە تاکو ئێستا پیاو دروستی کردووە، ئەگەرچی ژن بە لاوازی کارەکتەری هۆ بووە بۆ ئەوە، بەڵام هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ لایەنەکەی تر کە خۆی هەمیشە بە بەهێز داناوە و ویستوویەتی هەمیشە ئاغا بێت و لایەنەکەی تر لاواز.

هەڵبەتە ئەمە هەروا بۆ فیز نەبووە، بەڵکو دەچێتە قاڵبی هەستکردن بە کەرامەتێکی بەرز بۆ خۆی، نەک بۆ لایەنەکەی تر.

یەکەم هۆ بۆ ئەوە وشەیەکە بە ناوی (ئابڕوو) یان (ئابڕوومەندی). ئەمەش تەنها پیاو لەبەر خۆی دەیسەپێنێ و دەبێ ئافرەت ڕەچاوی بکات و ئەگەر هاتوو لە مانای ئەو وشەیە لای دا، ئەوە واتە ( بێئابڕوویی). ئەمەش هێزەکەی زۆرتر دەکەوێتە سەر پیاو.

ئەم دیاردەیە لە کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتدا زۆرتر بە زەقی دەردەکەوێت. هۆیەکەشی ئەوەیە کە هەوڵ نەبووە بۆ سەرکەوتن بەسەر نەخوێندەواریدا و هیچ سەرکەوتنێک نەبووە لە بواری بینینی ئەودیوی ڕۆشنبیری لە پشتی دەریاکانەوە. واتە داخستنی سنوور و تێکەڵاونەبوون لەگەڵ شارستانیەتی میللەتانی

تر کە توانییان بەسەر هەندێ بازنەی بەستراوی ژیاندا باز بدەن.
شایەنی ئاماژەیشە کە ئایین ڕۆڵێکی باڵای هەبووە لەو بوارەدا، چون نەیویستووە مرۆڤ، بە تایبەت ئافرەت کە بووەتە هەرە گرنگترین خاڵی ئەم بابەتە و بووەتە هۆی دروستبوونی وشەی ( عەیب و ئابڕوو) و هیی تر.
ئایین هەندێ خاڵی جۆراوجۆری داناوە و یەک دانەی پیاو ناگرێتەوە. زۆربەی ئەو خاڵانە بۆ داگیرکردنی هێزی ژن و نەهێشتنی لە ناوەڕاستی کۆمەڵگە و دوورخستنەوەیەتی لە هەموو گۆڕەپانەکانی ژیان و قوفڵکردنیەتی لە بەشداریکردنی کۆمەڵگە بۆ پێشخستنی.
ئیزدواجیەتی فیزیکیی مرۆڤ لە تەنها پیاو و تەنها ژندا ناوەستێ، بەڵکو لە دروستبوونیەوە ئەم دینامیەکیەتە فیزیکییە کارەکتەرێکی ناوەڕاستیشی دروست کردووە. ئەویش ڕەگەزی دوو جنس، ئەمەش وای کرد وەکو بڵێی هەردوو جنسەکە قبووڵی جیاکردنەوەیان نەکردووە، لەبەر ئەوە هەوڵی داوە ئەفسانە لە دوای ئەفسانە دروست بکات تا پشتگیری لەم دووڕەگییە بکات، جا هەوڵی داوە چەندەها خواوەند دروست بکات و شێوەی هەردوو ڕەگەزەکەی تێدا بداتە ڕوخسار و شێوەی.
لەبەر ئەمە، کاتێک زانستی دەروونی پەیدا بوو، زاناکان هەوڵەکانیان خستە گەڕ تاکو جیاکردنەوەی نێر لە مێ زیان بە مرۆڤایەتی ئەگەیەنێ و یاسا سەرکوتکەرەکان لە هێزی چالاکی کەم ئەکاتەوە. گۆستاف یۆنگی زانای سویسری یەکێک لەو نموونە کاریگەرانەی لە ڕەگەزی پیاودا دەرخست و ناوی لێ نا (ئەنیما) و پێناسەی کرد بە هێزی (مێ) لە ڕەگەزی (نێر)دا. بەرانبەر ئەوەش بوونی هێزی نێری داپۆشراو لە ڕەگەزی مێ کە بە (آنیمۆس) پێناسەی کرد.١
دکتۆرە نەوال ئەلسعداوی لە کتێبی (االانثی هی الأصل)دا دەڵێ: لە لایەنی فیزیۆلۆجی و بایۆلۆجییەوە شتێک نییە بە ناوی پیاو ١٠٠٪ و ژن ١٠٠٪ بەڵام هۆرمۆناتی جنسیی نێر و مێ تێکەڵن و لە کاتی دروستبوونیاندا هەندێ لە ئەندامی نێر لای مێ دەمێننەوە و لەولاشەوە هەندێ ئەندامی مێ لای نێر دەمێننەوە، تەنانەت لە ژیانی هەردوو ڕەگەزەکەشدا هۆرمۆناتی نێر و مێ ئەمێنێتەوە.٢
جا لەبەر ئەوەی تیشک بخەینە سەر بابەتی یاخیبوونی ڕەگەزی مێ لە کۆمەڵگەی پیاوسالاریدا، بە تایبەت لە کۆمەڵگەی خۆمان لەم سەردەمەدا، پێش ئەمە هەوڵ دەدەین نموونەیەک لە یاخیبوونی ڕەگەزی مێ بخەینە ژێر باس و لێکۆڵینەوە، بەڵکو بتوانین چارەسەر، یان هەر نەبێ، بۆ زانین سوودی لێ وەربگرین. باسکردنیش لەسەر ئەمە ئەوەیە لە یاخیبوونی مێدا هۆرمۆنی نێر زاڵتر دەبێت، نەک بە شێوەیەکی گشتی، بەڵکو لە هەندێ کەسدا. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ زاڵبوونی لایەنێکی کارەکتەری و ئەویش با ناوی لێ بنێین کارەکتەری ئەدەبی، چونکە مێ لەم حاڵەتەدا ڕەنگە نەتوانێت ئەو هێزە تەواوە بخاتە ڕوو، هەرچەند لە نێردا هەیە، بەڵام خۆ دەتوانێ هەستی نێریی خۆی دەربخات، ئەگەرچی لە ڕێگەی نووسین و ئەدەبیات و تەنانەت لە هەندێ بابەتی کۆمەڵایەتییشدا بێت.
دیارە کە من فێمینیستی کۆمۆنیستی دەکەم بە نموونە، نەک لەبەر ئەوەی لایەنگیری کۆمۆنیستم، بەڵام هەر نەبێ، وەکو هەڵوێستی مرۆڤێک کە بیرکردنەوەی چەپی هەڵبژاردبێ بۆ ژیانی و پێی باش بووە ئەم بیرکردنەوەیە هەڵبژێرێ و بۆ چارەسەرکردنی ئەم لایەنە کە جێگەی باسە، بە باشی زانیوە.
لێرە خانمەنووسەرێکی چەپ دەخەمە ژێر لێکۆڵینەوە، لەبەر ئەوەی نەک تەنها ئافرەت بوو، بەڵکو وەکو یاخییەک لە یاسا و ڕێسای پیاوسالاری و دەربازبوونی لە بازنەی سەرکوتکردنی مێ و بەستنەوەی بە وشەی (عەیب) و ( ئابڕوو)ی ئەم کۆمەڵگەیە خۆی نواند کە وەکو وتمان، لەژێر کاریگەریی ئایین و کولتووری بەهێزکردنی پیاو و قوفڵدانی مێ لە نێو چوار دیواری بێدەرگای جەهالەتدا بوو. «ئەحلام مەنسوور» وەکو نموونە ئەوە نانوێنێ کە تەنها ئەو بووە لەم قاڵبە دەرباز بووە، بەڵکو لەسەر ئاستی مێژووی کوردستان لەم جۆرە زۆر هەن، بەڵام ئێمە لێرەدا وەکو نموونەیەک

١ الأدب النسائی، هل هو ظاهرة استثنائیة؟ ریتا عوض، مجلة وجهات نظر، العدد الخامس، أبریل٢٠٠٠، ص ٦٥.

٢ الأنثی هی الأصل، نوال السعداوی، المؤسسة العربیة للدراسات والنشر، الطبعة الأولی، ١٩٧٤، ص ٧٩.

ئەممان هەڵبژارد، چونکە سەردەمە سەردەمێکی زۆر ناسک بوو کە ئەم جۆرە یاخیبوونە سەرهەڵبدات.
ڕەنگە مامۆستا ئەحلام هەلومەرجێکی گونجاوی دەستکەوتبێت تاکو بتوانێ ئەمە ئەنجام بدات، هەر لە تێکەڵاوبوونی لەگەڵ ئافرەتانێک کە بە ئایین موسوڵمان نەبوونە و لە سەردەمێکدا ژیاوە کە داگیرکەری بەریتانی کاریگەریی لەسەر زۆر شت هەبوو و دواجار تەنانەت لەسەر دەرخستنی ئازادی ژنان و شێوە ڕەفتارێک کە لە پێشچاوی خەڵک دەیانکرد کە لە سیستەمی شارەکەدا نەبوو و ڕەوشتی ئەو ئافرەتە بێگانانە کە بە پێشکەوتن ناو دەبرا، ئەوجا سەرەڕای ئەوەش، لە سەردەمێک ژیاوە کە باوی کۆمۆنیست بوو و یەکێتیی سۆڤێت و سیستەمەکەی زۆرتر کاریان دەکردە سەر ڕۆشنبیریی فیکر و هۆشی هەموو گەنجەکانی ئەو سەردەمە.
ئەگەر مامۆستای خوالێخۆشبوو، ئەحلام مەنسوور و هەڵسوکەوتەکانی وەکو خۆی بخوێنینەوە و بزانین لە نێو چ خانەوادەیەکدا پەروەردە بووە، ئەویش دەبێتە خاڵێکی تری ئەو یاخیبوونە کە باوکی فەرمانبەر بووە و ئەو کاتە جیاوازییەکی ژیانیی گەورە هەبووە لە نێوان فەرمانبەر و کرێکاردا، ئەویش بە هۆی ململانێی هەردوو سیستەمی سەرمایەداری و سۆسیالیستی کە لە پێشبڕکێیەکی گەورەدا بوون بۆ سەرخستنی سیستەمەکەیان، وەکو بڵێی گۆڕەپانی ئەم شوێنانە بووبووە شوێنی ئەو ململانێیە، هەروەها خانەقینیش هەر لەو سەردەمەوە و ئێستایشی لەگەڵدا بێت، شارێک بووە هەندێک ژیانی دیموکراسیی تێدا بووە و بەڵگەش بۆ ئەوە ئەوەیە کە مەسیحی و موسوڵمان و کاکەیی و جوولەکە بەیەکەوە دەژیان و هیچ کێشەیەک لە نێوانیاندا نەبووە و کورد و عارەب و و تورکمان و هیی تریش بەبێ جیاوازی دەژیان، ئەمەش وای کرد کە تێکەڵبوون ببێتە یاسایەکی ئەخلاقیی بێ غەلوغەش.
ڕەنگە مامۆستا ئەحلام هەر لاسایی ژیانی ئەوانی تری پێ خۆش بووبێت بە هۆی نزیکبوونی جێی نیشتەجێبوونی لە ئەوانی تر. مامۆستا ئەحلام لە یەکێک لە نووسینەکانیدا بە ناوی «خەون و خوێن» دەڵێت: «من پەلکەزێڕینەیەکم لە ئاسمانی تاریکدا کە هەمیشە هەر ونم، بۆ ئەم ونبوونە هەر کۆتایی نایەت، نا نا.. لە بازنەیەکی بەتاڵدا ناسووڕێمەوە، دەزانم چی دەکەم و کام ئەستێرە بۆنم دەکات، زۆر جار ڕەنگەکانم لە یەکدی جیا نابنەوە، هەریەکە و بەرەو تەوەرێک باڵ دەگرن، خۆشم، واتە ڕۆحم، نازانم لە ناو کام ڕەنگدایە، هەر کە ڕەنگەکان دەلکێنەوە بەیەکەوە، ئازاد دەبم و تلیاکێک دەکێشم کە بریتییە لە وشە، نا نا، لە نوقڵ ناچن، بەڵکو لە فرمێسک دەچن، سوێرن، شیرین نین، تاڵن، یەک بە یەک وشەکانم دەکێشم و بەنگ دەبم و وڕێنە دەکەم، جاری وا هەیە ڕەنگێکم دادەبەزێ بو ناو زیندانێک لە زیندانەکانی جیهان، یان گۆڕێک لە گۆڕە بێنازەکان کە خاوەنەکانیان لەدایک بوون و مردوون بێ ئەوەی بژین، یان هەندێ جار لە ناو سێبەرێکی ڕەشدا ون دەبم، سێبەرێک کە گەماڕۆم دەدا و نابم بە خۆم، سێبەرە بێڕەنگەکان بە پەتی سێدارەکانیان ملم جەڕ دەدەن، جارێ واش هەیە دێرەکانم دەبن بە پەت، بە ملمدا دەئاڵێن وەکو لاولاو گەڵاکانی تەمەنم وشک دەکەن، گەڵاکان هەڵدەوەرێنەوە سەر شۆستەکان، پیتێکم دەبێتە مار و پیتەکانی ترم دەبن بە کەلەپچە و مەچەک و قاچەکانم دەگرن، وشەکانیشم دەبن بە دووپشک و ژەهر دەرخواردی مەرەکەبی پێنووسەکەم دەدەن، نووسین لای من جۆرێکە لە دەرمانخواردکردنی شانەکانی مێشکم و خڕۆکە سوور و سپییەکانی خوێنم.
لە دەستی چەپمدا کلیلێک هەیە کونی قنگی مرۆڤە دۆڕاوەکانی پێ دەکەمەوە، خشتێکیش لە سەر سنگم دایە ناوی ئایینەدیە، دەشزانم ئایینەدەم لە زیندانێکدا تەواو دەکەم کە ناوی دەفتەرە، بۆیە هەمیشە بە قیست گیان دەدەم و دەمرم و نامرم.»
لێرەدا مامۆستا ئەحلام هەست بە نامۆبوونی خۆی

ئەحلام مەنسوور

و ڕەگەزەکەی دەکات، تا هێزی تێدایە پێنووسەکەی بەکار ئەهێنێ، چونکە هەموو دەرگاکانی ژیانی ئازادی لێ داخراوە، هەمیشە بەدوای ئازادیدا دەگەڕێ، هەمیشە گلەیی لە ژیان ئەکات کە بۆ و چۆن وای بەسەر ئەم ڕەگەزەدا هێناوە؟ هەرچی ڕق و کینەی ئاسمان و زەوی هەیە، دەرژێتە سەر ڕەگەزەکەی و دەرەتانیان لێ بڕیوە و دەرگاکانیان لێ داخراوە، کەچی ئەو هەموو شتە نالەبارەی بەسەر ئەواندا دێ، هەڵی بگێڕێتەوە، بە باشی دەچێتە قازانجی ڕەگەزەکەی تر بێ ئەوەی هیچ خۆی ماندوو بکات.

ئۆجەلان دەڵێ: ئەگەر ویستت کۆمەڵگەیەک ئازاد بکەی، یەکەم جار مێشکی ژن ئازاد بکە، چونکە بەبێ ژن هیچ کاتێک بە کۆمەڵگە ناوترێ ئازاد، ئاخر ئازادی واتە هەموو مرۆڤێک، ئەگەر لایەنێکی ئازاد بوو و ئەوی تر نا، ئەمە چۆن ئەکرێ پێی بوترێ ئازادی؟

ئەم ئازادیی ژنە لە هەموو ئەدەبیات و سیستەمی مارکسیزمدا بە زەقی دیارە و لە بەرپابوونی مارکسیزمدا ئەمە نەک تەنها نووسینێکە و بەس، بەڵکو کاری پێ کراوە و لە هەموو ئەو دەوڵەتانەدا کە ئەم سیستەمەیان بەکار هێناوە، ژن یان ئافرەت هیچ جیاوازییەکی نەبووە لەگەڵ ڕەگەزی نێردا، مەگەر لە ڕووی فیزیکییەوە نەبێت، ئەگینا هەردوو لە نێو سیستەمەکەدا وەکو یەک و شانبەشانی یەک هەمان باری ژیانیان هەڵگرتووە.

مامۆستا ئەحلام لە شارێکی وەکو خانەقین لەدایک بووە و ژیاوە، لە خانەقینیش سیستەمی مارکسیزم لە سەرەوەی قوتابخانە ڕۆشنبیرییەکان بووە کە کاریگەریی لەسەر بیر و هۆشی ئەدەبدۆست و هونەردۆست و ئەدیب و نووسەر و کەسایەتیی شارەکە بووە و تاکو ئێستاش ڕەنگە ڕەنگدانەوەی ئەوە بێت کە ئەگەر بە ژماردن بێت، ڕێژەی ڕۆشنبیر و مامۆستا و کەسایەتیی سیاسی و زانستی و هونەرمەند و وەرزشەوان و... لە هەموو شارەکانی کوردستان زۆرتر بووە، بەڵکو لە شارەکانی عێراقیش.

لە نووسینێکیدا بە ناونیشانی «دیس تۆپیا» مامۆستا ئەحلام زۆر بە داخەوە باسی خەون دەکا. تەنها خەون، ئەمە هێشتا بێدارییش نەبووە، خەونە، ئیتر دەبێ لێرەدا بزانرێ چی تراجیدیایەک بەسەر ئەم ڕەگەزەدا هاتووە. دەڵێت: «لە چاڵێکی دوو مەتریدا مەڵاسم داوە، مردووەکانی چواردەورم، نامە و زەردەخەنە و گوڵ دەگۆڕنەوە، هەریەکە و خەریکی خەونێکە، تەنها چاوەکانی خەونەکانی من کوێر بوون، بۆیە قاچەکانم لە شوێنی خۆیاندان و تەنها گوێم لە خورپەخورپی دڵە مردووەکەمە، بۆ زانینتان، جیاوازییەکی زۆر لە نێوان دڵی مردوو و دڵی زیندوودا نییە، دڵم حەزی لە ڕەنگی خەونە، جاران حەزی لە خەون نەبوو، چونکە هەر لە منداڵیمەوە، وەک دەڵێن، منداڵێکی بێخەون بووم، شەو و ڕۆژ هەر خەریکی زیندەخەون بووم.»

مامۆستا ئەحلام لەم بابەتەدا بە ڕاشکاوی دەڵێ هیچ جیاوازییەک نێوان دڵی زیندوو و دڵی مردوودا نییە! هەروەها دەڵێ: «دڵم حەزی لە ڕەنگی خەونە،

جاران حەزی لە خەون نەبوو، چونکە لە منداڵییەوە بێخەون بووم.»
لە تێکستەکەدا خەونەکان بە واتای ئازادی هاتوون، پێشان لەبەر ئەوەی لە زیندانی دەریای جەهالەتی کۆمەڵایەتیدا بوو، بەڵام ئێستا هەرچەندە تەمەن چوو، ئەمیش ئازاد کرا، بەڵام چ ئازادییەک؟ جا بۆیە دەڵێ دڵم حەزی لە ڕەنگی خەونە (هەڵبەت کە هێشتا لەژێر دەستی یاسای قیزەوەنی کۆمەڵایەتیدا بوو). جا ئەمە هۆی سەرەکیی یاخیبوونیەتی وەکو مافێکی ڕەوای ژیانێکی ئازاد و هەڵبژاردنی یاخیبوون تەنها لەبەر ئازادییە و ئازادییش خەونی هەموو مرۆڤێکە، بە تایبەت ژن.
ڕەنگە کەم میدیا باسی ئەحلام مەنسووری کردبێ یان ڕەنگە هەر هەمان هۆ بووە کە تەنانەت خۆیشی نەیتوانیوە بە خەستی باس لەو هەموو تەنگوچەڵەمەیە بکات کە ڕووبەڕووی ڕەگەزی مێ بووەتەوە. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە مامۆستا ئەحلام تەنانەت خێزانەکەیشی جێ هێشت و هەتاکو کۆچی کرد، بە دەگمەن پەیوەندیی هەبوو لەگەڵ ئەو ماڵباتەی کە تێیدا ژیا، هەرچەندە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە ماڵباتەکەی شێوەی ژیانیان لە ئاستێکی ڕۆشنبیریدا بوون.
مامۆستا ئەحلام چەند بەرهەمێکی هەبوو و هەمووی دەربارەی ئەو بابەتە بوو کە بەرگری لە مافی ژن دەکا لە نێو کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتدا، بە تایبەت کۆمەڵگەی کوردی و لەوە تایبەتتریش، شارەکەی.

پوختەیەک لە بەرهەمەکانی مامۆستا ئەحلام مەنسوور:
١- هاوار، دەزگای ئاراس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، ژمارەی چاپ: ٨٤٣، ٢٠٠٩.
٢- دیس تۆپیا.
٣- ئەڵوەن، ڕۆمان، دەزگای ئاراس، ژمارە چاپ: ٣٠١، چاپی یەکەم، ٢٠٠١.
٤- ئەزموون، گرەوی چاوەکانی ئەم، ٢٠٠٧.
٥- خەون و خوێن.

ئەحلام مەنسوور

# له یادی (ئەحلام مەنسوور)دا

**لەتیف هەڵمەت**

ساڵی ١٩٧٥ کە لە پیلانی ئەلجەزائیردا کۆتایی بە شۆڕشی ڕزگاریخوازیی کورد هێنرا، گەڕامەوە بۆ عێراق. لە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی دامەزرام و لە ڕۆژنامەی هاوکاری کاری هەڵەچنیم دەکرد. لە گۆڤاری «بەیان»یش سەرپەشتیی لاپەڕەکانی شیعرم دەکرد و بیروڕای خۆم دەربارەی ئەو شیعرانە دەخستە ڕوو کە شیاو یا نەشیاوی بڵاوبوونەوە بوون...

من لەو دەزگایەدا نووسەر و چیرۆکنووسی جوانەمەرگ (ئەحلام مەنسوور)م ناسی، شایانی باسە کە بۆ یەکەم جار لە ڕاڕەوێکی دەزگاکەدا یەکدیمان بینی ئەو وەکو کەسێک قسە و تەوقەی لەگەڵدا کردم کە دەمێک بێ یەکتر بناسین.. بەڵام من گوتم خانم من بەڕێزتان ناناسم و حەز دەکەم بزانم کێن.. گوتی من ئەحلام، ئەحلام مەنسوورم، ئەی پار لە کۆڕەشیعرییەکەدا یەکدیمان نەناسی! گوتم ببوورە لە یادم نەمابوو.. ئیتر گوتی لە بەشی ئەرشیڤی دەزگاکە ئیش دەکات و هەر ئیشێکی ئەرشیڤم هەبێ، بە خۆشحاڵییەوە بۆم جێبەجێ دەکات. منیش پێم گوت لە چی بەشێکی دەزگاکە ئیش دەکەم. ئیتر ئەو هەندێ جار سەردانی ژوورەکەی منی دەکرد و منیش هەندێ جار سەردانی بەشی ئەرشیڤم دەکرد کە ئەحلام خان ئیشی تیادا دەکرد.

لەو دیدارانەدا باسی شیعر و بابەتەکانی دیکەی ئەدەب و هونەرمان دەکرد و هەندێ جار ئەگەر بابەتێکی جوانی لە ڕۆژنامەیەکی عەرەبیی ئەو دەمەدا بخوێندایەتەوە، بۆی دەهێنام و دەیگوت ئەمە بابەتێکی جوانە

بیخوێنـەوە، دوایـی بیهێنـەرەوە بـۆ ئەرشـیڤ، منیش دڵیـم نەدەشـکاند و دوای خوێندنـەوەی یا نەخوێندنـەوەی بۆ ئەرشـیڤم دەبـردەوە. زیاتریش حەزی دەکرد باسی ئەدەبی بوونگەری و بێهودەیی بکەیـن و لەبـارەی بەرهەمەکانـی سـارتەر و کامۆ و سـیمۆن دی بۆڤـوار و کۆڵـن وڵسـن و کافکا و هتد... بدوێن. ئەو دەمە ناوی نووسـەری عەرەبی، زەکەریـا تامـر، زۆر بـڵاو ببـووەوە و خوێنـەران سـەوداسـەری کورتەچیرۆکەکانـی بـوون. بـە ڕێکـەوت ڕۆژێ لە ڕۆژان کۆمەڵە کورتەچیرۆکی «دمشـق الحرائـق»م لـە کتێبخانەیەکی شـەقامی ئەلموتەنەبیـدا بەرچاوکـەوت. لەبـەر ئـەوەی ئەحـلام پێشتر کراسـێکی بـۆ کڕیبـووم، منیش دوو کتێبـم لـەو کۆمەڵـە کورتەچیرۆکـە کـڕی و دانەیەکیانـم پێشـکەشـی ئەحـلام کـرد. زۆری پـێ خـۆش بـوو و گوتـی وەڵا هەڵدەکـەوێ، مـن چەنـد سـاڵە لـە بەغـدا دەژیـم و تووشـی کتێبـی لـەم جـۆرە نەبـووم، تـۆ دوێنـێ هاتـی بـۆ بەغـدا و شـارەزای هەمـوو شـوێنێکی... منیش گوتـم مـن لـەو دەمـەوەی کە لە گەرمیان و کەرکوک بووم، سـەردانی بەغدام دەکرد و لە شـەقامی موتەنەبی (دار الکتب القدیمة) و (سـوق السـرای) کتێبـم دەکـڕی... جگـە لـەوەش، چـاوی تـۆ زیاتـر بـۆ کۆگاکانـی جلوبـەرگ دەگـەڕێ و چـاوی مـن بـۆ کتێـب و کتێبخانـەکان... جێـی خۆیەتـی بڵێـم ئـەم کۆمەڵـە کورتەچیرۆکـەی زەکەریـا تامـر زۆر سـەرسـامی کـردم و داخێکـی زۆرم بـۆ خـوارد کاتـێ لـە سـەرەتای هەشـتاکاندا بـە هـۆی پێشـمەرگایەتیی بـرا ناوەنجییەکەمـەوە ماڵـی باوکـم لـە کەرکوک ڕاگوێـزران و ئـەو کتێبـەش لەگەڵ سـەدان کتێبی دیکـەی خـۆم و باوکمدا بە تاڵان بران. نایشارمەوە من ئـەو کتێبـە وا سـەرسـامی کردبـووم لەوسـاوە تاکـو ئێسـتاش ڕێگـەم بکەوێتـە هـەر کتێبخانەیـەک، بـۆ ئـەو کتێبـە دەگـەڕێـم. دەشـێ بەشـێک لـەو سـەرسـامییەم هیـی

ئەوەبـێ کـە ئـەو کۆمەڵەچیرۆکـە هاوڕێیەتیی مـن و ئەحلامـی پتەوتـر و توندوتۆڵتـر کـرد و بـە دەیـان ڕۆژ پێکـەوە لـە ژووری ئەرشـیڤ و هـاوکاری و بەیانـدا باسـی جوانـی و شـاکارێتیی ئـەو کۆمەڵـە کورتەچیرۆکـەی زەکەریـا تامرمـان دەکـرد، تەنانـەت بیرمـان لـەوە کـردەوە چەنـد چیرۆکێکـی لـێ بکەیـن بـە کـوردی... بـەڵام ئـەم پڕۆژەیەمـان سـەری نەگـرت. ڕۆژێـک ئەحـلام گوتـی مـن دەمێکـە دە چیرۆکـی کوردیـم هەڵبـژاردووە بیانکـەم بـە عەرەبـی. بـۆ نایەی لـەم پڕۆژەیـەدا هاوبەشـم بیـت و بـە هەردووکمـان هـەر دە چیرۆکەکـە وەربگێڕینـە سـەر زمانـی عەرەبـی و لـەو لاپەڕەیـەی ڕۆژنامـەی «العـراق»دا بـڵاوی بکەینـەوە کـە بـۆ ڕۆشـنبیریی کـوردی تەرخانـی کـردووە... جێـی خۆیەتـی بڵێـم لـەو دەمـەدا ئـەو لاپەڕەیـە لـە لایـەن شـاعیر و ڕۆژنامەنووسـی جوانەمـەرگ «عەبـاس ئەلبەدری»یـەوە سـەرپەشـتی دەکـرا و بـە ڕێـوە دەچـوو... سـەرنووسـەری ڕۆژنامەکـەش کوردپـەروەر و دڵسـۆزی وشـەی کـوردی، خوالێخۆشـبوو «سـاڵح حەیـدەری» بـوو. ئیتـر دوای یـەک دوو ڕۆژ ئەحـلام چیرۆکەکانـی هێنـا و گوتـم تـۆ زۆر ئاگاداری کولتووری وێژەیی کـوردی نیـت، چـۆن ئـەم دە چیرۆکـە جوانـەت دۆزییـەوە و بڕیاری بەعەرەبیکردنیانت دا؟ وا بزانـم گوتـی مامۆسـتا حوسـێن عـارف هەڵـی بـژاردوون و گوتوویەتـی ئەگـەر دەرەقەتـی بێـی، پڕۆژەیەکـی بەکەڵـک دەبـێ بـۆ ئەدەبـی کـوردی...
ئیتـر پێکـەوە دەسـتمان کـرد بـە وەرگێڕانـی چەنـد چیرۆکێـک لـەو دە چیرۆکـە و ئەگـەر بەهەڵـەدا نەچووبـم، چیرۆکـی (مودیـر بـەگ)ی شـاکر فەتـاح و (شـاییەکەی دەشـەی خەجـەلاو)ی عەلائەدیـن سـەجادی و (سـەیرانێک لـە ئەزمـڕ)ی موحـەڕەم محەمـەد ئەمیـن بـە کۆششـی هەردووکمـان کـران بـە عەرەبـی و لـە لاپـەڕەی ناوبـراوی ڕۆژنامـەی «العـراق»دا بڵاومـان کردنـەوە. خۆمـان و خوێنەرانێکـی زۆریـش بـەو پڕۆژەیـە خۆشـحاڵ بوویـن. جێـی خۆیەتـی ئـەوە ڕووماڵ بکـەم لەگـەڵ بڵاوبوونـەوەی چیرۆکـی دووەمیانـدا لـە دیوانـی بەڕێوەبـەری گشـتیی دەزگاکـەوە ئاگادار کراینـەوە کـە نابـێ چیتـر ئـەو پڕۆژەیەمـان بـڵاو بکەینـەوە و بابەتەکانمـان لـە ڕۆژنامـەی «العـراق»دا بـڵاو

ئەحلام مەنسوور

بکەینەوە. من وەکو گەنجێکی یاخی و سەرگەرمی ئەو سەردەمە، ئەو جۆرە بڕیارەم پەسەند نەکرد و چیرۆکی سێیەمیشم بڵاو کردەوە. ئیتر بەڕێوەبەری گشتی تووشی هیستریا هات و ناردی بەدوامدا بۆ ئەوەی لێپرسینەوەم لەگەڵدا بکات.. منیش بە قسەیم نەکرد و ئیتر هەر ئەو ڕۆژە و لەسەر ئەوە بە ڕواڵەت و {ئەگەر نەبێ بە خۆهەڵکێشان} لە ڕاستیدا لەسەر ئەوەی ڕەچاوی ڕێنمایی و بڕیارەکانی ئەوی کۆیلەی ڕژێم و کۆیلەی پلەوپایەم نەدەکرد و لێرە و لەوێ شیعری بەرگریم بڵاو دەکردەوە و لە کۆڕی شیعری بەرگریدا بەشداریم دەکرد و مژدەی سەرنگوونبوونی دیکتاتۆرم بە خوێنەرانی شیعر دەدا و باسی هەتاوی ئازادی و داربەڕووی نەمرم دەکرد... بە بڕیارێکی نایاسایی و بە خواستی خۆی لە دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی دەری کردم. لەبەر ئەوەی بارودۆخەکەی زۆر ڕەش و سەخت و ناهەموار بوو، قسەم نەکرد و دادوهاوارم بۆ لای کەس نەبرد و گەڕامەوە بۆ کەرکوک. گەلێ لە برادەرانی ئەو سەردەمە پیرۆزبایی و ئافەرینی ئەو هەڵوێستەیان لێ کردم...

دوای چەند هەفتەیەک، لە بیرم نییە بە چ کەسێکدا بوو، ئەحلام هەواڵی بۆ ناردم کە بەڕێز مامۆستا عەباس ئەلبەدری پێی گوتووە با لەتیف هەڵمەت بێت لە ڕۆژنامەی «العراق» لە لاپەڕەی «صفحة الثقافة الكردية»ی ڕۆژنامە دایدەمەزرێنین و ناسنامەی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراقیشی بۆ دەکەین...

ئیتر گەڕامەوە بۆ بەغدا و لەگەڵ ئەحلام مەنسووردا چووم بۆ ڕۆژنامەی «العراق». لەوێ خوالێخۆشبوو مامۆستا عەباس ئەلبەدری پێشوازییەکی گەرمی لێ کردم و بە خوالێخۆشبوو مامۆستا ساڵح حەیدەریی ناساندم و پێی گوت ئەمە «لەتیف هەڵمەت»ی شاعیرە. ئیتر هەر ئەو ڕۆژە بڕیاری دامەزراندم لەو ڕۆژنامەیە درا و پاش شەش مانگ بووم بە ئەندامی کارای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراق و گەلێ جار ئەحلام تەلەفۆنی بۆ دەکردم و زۆر جاریش دەیگوت لە کاتێکی لەبار و گونجاودا پرۆژەکەمان تەواو دەکەین.

# ئەحلام مەنسوور

سالّی ١٩٧٧ کۆمەڵێک برادەر و هاوڕێی عاشق و دیوانەی شیعر و وشەی کوردی زۆریان هان دام کە ئەو شیعرانەی لە کۆڕەکاندا دەمخوێندنەوە، لە دیوانێکدا کۆ بکەمەوە و چاپیان بکەم. کە بڕیاری ئەو پرۆژەیەم دا، شەهیدی نەمر بورهان شێخ مستەفا مەعرووف قەرەداغی و محەمەد ساڵح عەبدولکەریم بەرزنجی و خانمێک بە ناوی حەلیمە بە هەرەوەزی لە نووسینەوەی دەستنووسە شیعرییەکانمدا یارمەتیی زۆریان دام و کاتێک ئەحلام هەواڵی چاپکردنی دیوانەکەم «پرچی ئەو کچە ڕەشماڵی گەرمیان و کوێستانە»ی پێگەیشت، هات بۆ لام و پێی گوتم ئەگەر لەسەر پارە پەکت کەوت، هەردوو چاوی خۆمت بۆ دەفرۆشم و دیوانەکەتی پێ چاپ بکە... ئەو قسەیەی ئەحلام موچرکەی بە لەشمدا هێنا و سوپاسی ئەو هەڵوێستە جوانەیم کرد و بەرزم نرخاند... شایانی باسە هاوڕێی جوانەمەرگم، شاعیری لاوی ئەو سەردەمە (فەریق ئەمین) بەبێ ئەوەی پێی بزانم، چووبوو بە ناوی خۆیەوە قەرزێکی زۆری بۆ کردبووم بۆ ئەوەی لە چاپکردنی دیوانەکەدا تووشی کۆسپ و تەگەرە نەبم.

ئەگەر ئەو پارانەم دەست نەکەوتایە کە ئەو بۆی قەرز کردبووم، لەوانە بوو ئەو دیوانەم لەو کات و دەمەدا وا بە ئاسانی چاپ نەکرایە و ساڵێ دوان دوابکەوتایە... سەیر ئەوە بوو کە دیوانەکە «پرچی ئەو کچە ڕەشماڵی گەرمیان و کوێستانە» کەوتە بازاڕەوە، خوێنەواران و برادەران وایان دەزانی مەبەستم لەو پرچە، پرچەکەی ئەحلام مەنسوورە.. بەڵام لە ڕاستیدا من مەبەستم لەو پرچە، پرچی درێژ و ڕەشی کچێک بوو کە ڕۆژێ خۆیی پێ ناساندم و گوتی لە فلان زانکۆ قوتابیم و ئیتر دوای ماوەیەکی کەم ئەو کچە نامەیەکی بۆ ناردم بۆنی خۆشەویستی و سۆزداریی لێ دەهات. منیش بە هەمان شێوە وەڵامی نامەکەیم دایەوە و دواتر تەگەرەیەکی بچووک هاتە ڕێگەی خۆشەویستیمان و بوو بە هۆی ئەوەی کە بۆ یەک نەبین و لێکدی دووربکەوینەوە... بەڵام شەش حەوت نامەییم پاراستووە وەکو یادگارییەکی ئەو عەشقە جوانەمەرگەمان...

بەڵام با مێژوو بە هەڵە نەنووسرێتەوە، من لەو تەمەنەی سەرەتای لاویمدا ئەحلام تەنها هاوڕێیەکی ئەدەبیم بوو، هیچ جۆرە خۆشەویستییەکی ئاشکرا و نهێنی لە نێوان من و ئەحلام خانی جوانەمەرگدا نەبووە و هیچ نامەیەکی سۆزداریشمان لە نێواندا نەبووە، بەڵام من وەکو ڕێزلێنانێک بۆ کچێکی نووسەر و دڵسۆزی وشە، چەند شیعرێکم لە دیوانەکەمدا پێشکەشی ئەحلام کردووە و لێم نووسیون پێشکەشە بە (ئ . م)، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەحلام لە کاتی چاپکردنی دیوانەکەدا گوتی ئەگەر لەسەر پارە تەگەرە کەوتە ڕێگەی چاپکردنی دیوانەکەت... بە ئەرکی شانی خۆمم زانی کە ئەحلام یەکێک لەو کەسانە بێ کە دیوانەکەی پێشکەش بکەم..

لە پاشکۆی ئەم نووسینەمدا حەز دەکەم ئەو لاپەڕەیەی دیوانەکەم بخەمە ڕوو کە دیوانەکەم تیادا پێشکەشی ئەحلام کردووە و ئەو چەند شیعرەش ڕووماڵ بکەم کە بۆ ئەحلامم نووسیون و شیعرەکانم هەر لە دیوانە چاپکراوەکەوە وەکو بەڵگەنامەیەک فۆتۆکۆپی کردووە و خوێنەری ژیر دەتوانێ تارمایی ئەحلام مەنسوور بە ڕوونی بدۆزێتەوە... فەرموون ئێوە و ئەو شیعر و بەڵگانە:

پێشکەشە:
بە گیانی پیرۆزی دایکم
بە منداڵەکانی کوردستان
بەو کچەی خۆشم دەوێ
بەو کچە دڵسۆزەی کە وتی هەردوو چاوی خۆم دەفرۆشم و لە چاپکردنی ئەم دیوانەدا یارمەتیت دەدەم

گوڵی شیعر
خەوم بینی من هەور بووم و تۆ تینوو بووی
دەتکامە گەرووی تامەزرۆی تەمتەوە

خەوم بینی بووم بە خۆرو
دەڕژامە ناو دارستانی پەرچەمتەوە...
کچێ بەخوا درۆناکەم هێشتا بۆنی گوڵی شیعرم
وا بە قژو لادەمتەوە...

**هێلانە**

هێندەی تاڵی کەزی و پرچت
هۆنراوەی جوان لەدڵمایە
هەرچەن دەستی ڕەشەبایە
دەرگای دڵم دەترازێنێ
هەر چۆلەکەی هۆنراوەیەو
هەڵدەفڕێ و خۆی بە سنگ و مەمکی تۆوە
دەنووسێنێ...
تۆ نە دار بەڕووی سەوزی
نە شاتووی ئەو کوێستانەی...
نە ڕوباری...
نە خەرمانی... تۆ... نە ڕەزی...
نازانم بۆ... بۆ چۆلەکەی هۆنراوەی من
لەگشت شوێنێ
بۆ پرچی تۆ دەجریوێنێ...

**ماچ**

ماچەکانم دەبن بە هەور...
ئاسمان ئاسمان دوات دەکەون...
لەسەر تەلی پەنجەرەکەی ژوورەکەتدا...
وەک پەڕەسێلکە دەخەون...
لە شوێنت دێن...
لە هەچ شوێنێ بۆنی تۆ بێ
بەرەو ئەوێ دەوروژێن...
ماچەکانیشم وەک خۆم
نە دایکیان هەیە... نە وڵات
نە کەس هەیە خەمیان بخوات...
پەڵەی هەوری بێ سنوورن...
گەردە لوولی سەوزی ئەوین...
بەشوێن تۆدا دەیان بات و دەیان بات...
ئەگەر شەوی زستانێکی سەهۆڵ بەندان
خشە لەپشت دەرگاکەت هات...
ئەوە هەوری ماچەکانمە
لە دەرگاکەی تۆ دەدات..!

خەونێکی دوور
خەوم بینی... بەرەبەیان
کچێکی جوان
ماچی دامێ و ماچی کردم
ماچی گەرم و نەرم و نیان
هەر ئەوەبوو لە خۆشی دا نەدەمردم...
وام زانی تۆی
کە تۆ نەبووی
پەڕەسێلکەی خەندەی شیعرم
دای لە شەقەی باڵ و ڕۆی
لەو ساتەوە هەر وێڵم و
دەگەڕێم بۆی...
ئەگەر ویستت کەوی وشەی
کێویلەی من دەربەدەرو خەمبار نەبێ
پرچت درێژ بکەرەوەو
لەژێریا واحەشارم دە
هەر تۆزقاڵێکم دیار نەبێ
ئەگەر ویستت دەسگیرانی شاعیرێک بی
لێت وەڕس و بێزار نەبێ
ئەگەر ویستت.....
ئەگەر ویستت.....
من بکەرە خۆشەویستت
چۆلەکەی گشت ماچە کۆنەکانی هەستم
بۆ خەرمانی پرچەکەی تۆ بەرەڵا کرد
کە تۆ پرچت کورت کردەوە
لەدەمی هەر مقەستێکدا
هەزارەها چۆلەکەی ماچی من مرد...
وشە هەیە... هەر کۆن نابێ و هەر ناسوێ و هەر
ناسوێ...
کچێ منیش
تۆم خۆش دەوێ و خۆشتم دەوێ و
خۆشتم دەوێ...
گیانە ئێمە لەچەرخی چەقۆدا دادەژین
چەرخی مەرگ و ژان و برین
چەرخی ژەنگ و چاو هەڵکۆڵین
بەر لەوەی دەستم ببڕن
پەنجە سوێکە کێویەکانم
لەناو هەوری مەمکەکانتا
لەگشت تۆزقاڵێکی گیانتا

ئەحلام مەنسوور

فێری خەوو فڕین بکە... خەوو فڕین...
بەرلەوەی دەمم هەڵپاچن
دەمم فێری دەم و لێوو گۆناو مەمک هەڵمژین
کە...
بەر لەوەی دەمت ببڕن...
دەمت فێری ماچ بەخشین کە...
لێ بەرلەوەی دڵت بە رق گۆش کرێ...
دڵت فێری سۆزو تاسەو ئەوین کە...
بووم بە هەورو زەنگۆڵ زەنگۆڵ
وشەی جوانم
دڵۆپ دڵۆپ
خوێنی گیانم
بەهەر تاڵەقژێکتەوە کرد بە مانگ و چراو
گڵۆپ...
تۆ هەموو‌بیت کوژانەوە...
بۆ هەموو‌بیت کوژانەوە...؟
ئەوا ئێستا بۆ زمانێ نوێ دەگەڕێم
تا لەگەڵ تۆدا پێ ی بدوێم...
وەرە ئەوەندە ماچت کەم
هەتا دەمم هەڵدەوەرێ
کچێ وەرە سوێسکەی پەنجە کێویەکانم
مەتۆرێنە لە کوێستانی پەرچەمت
کچێ وەختە لە عەزرەتا دەمم ببێ بە
چۆلەکەو هەڵبفڕێ
بۆ ناو دەمت...
تۆ ئەی کچە خەمبارەکە
خەمی هەموو مناڵانی ڕۆخی
وەندی چڕو شیرین
پەپوولەن و لە چیمەنی
وشەکانی تۆدا دەژین...
کە مناڵ بووی... دایکت نەیهێشت
لەوەندا ببی بە ماسی
تۆزێ لمی ڕۆخی وەندی بەپێتەوە
بدیبایە...
بە پرچ هەڵتی دەواسی...
ئێستا نەک تۆ گشت مناڵێکی ئەو
شارە
ئاوات خوازەی مەلەیەکە
لەسەر ڕۆخی ئەو ڕووبارە...
تۆ ئەی کچە خەمبارەکە
خە مبا ر مە بە
ڕۆژێ دادێ هەر دارێکی قەراخی وەند
بۆ هەزاران زۆردار دەکرێن بە سێدارە...
جا ئەو ساتە تۆیش مناڵ بەو
قوڕو لمی وەندم تێگرە لە بەیانی تا ئێوارە
من وەک دایکت لێت نادەم
دەستەکانت دەلێسمەوە و
تێر تێر ناو دەمت ماچ دەکەم...
لەژێر باڵما دەتشارمەوە تا لەشت وشک دەبێتەوە
شوێن جێکانی داخەکانت هێندە بە کوڵ هەڵدەمژم
هەڵدەمژم...
تا لەبیرت دەچێتەوە
دە بۆم بدوێ ئاسمانی شەوی سەروەندت
جارانی زوو
چەنێ شین بوو...
دە بۆم بدوێ
جیهانی مناڵی سەروەندت
چەندێ گەورە و بەرین بوو...
دە فێرمکە چۆن پاساری مەمکەکانت
دەستەمۆکەم...
دە فێرمکە چۆن پەپوولەی زامەکانت
بەرەڵای باغی ئاسۆکەم...
گەر ڕووباری باسکەکانت ئاگریش بن
من حەز دەکەم پەنجەکانمی تێ ژەنم
خۆ فەرهاد نیم، بەڵام ئەگەر خۆشت بوێم
لەسەر هەموو تاوێرێکی ئەم وڵاتە
شیعرێکت بۆ هەڵدەکەنم
کچێ منی بێ دایکم بێ خۆشەویست
بووم بە هەور و هەر دڵۆپە بارانێکم...
گۆرانی بۆ ئافرەتێ وت
هیچ ئافرەتێ خۆشمی نەویست
هیچ ئافرەتێ دەنگی ناخی هۆنراوەکانی نەبیست
کە ڕۆخانە کەم کەم وەک شێت
شەوانی زستان هەڵدەچێت
گشت چۆڕێکی دەبێ بە مەم
گشت چۆڕێکی دەبێ بە مەم
گۆرانی بۆ چرای ژووری زینی گوندی نوستوو
دەڵێت
ڕۆخانە دێ و لە هاتنی شەوانەی دا
خێر و بێر و بەرات دێنێ

نە کچێ پێشوازی دەکا و
نە ماڵێکیش چرایەکی بۆ
هەڵدەکا و مۆمی بۆ دادەگیرسێنێت
منیش وەکو ڕۆخانە وام...
بۆ تۆ بووم بە چەمێ زام
چۆلەکەی ئەو کەژانەش دێ و
تینوێتی خۆی لێ دەشکێنێ
کەچی کچێک نییە جارێ
ئەنگوستی سۆز و قژی گیای کەناریی
چەمی شیعری من دابێنێ...!
کچێ دوێ شەو
تەنیاتر بووم
لەگشت شەوێ
خۆم هەڵدایە ناخی دیجلەی قوڵی خەوێ...
لە خەویشدا تۆ نەهاتی و هەر نەشهاتی...
کچێ ئاخر خەمی شاراوەی بێ تۆییم
کەمتر نیە لە بێ دایکی و بێ وڵاتی.

# ئەحلام مەنسوور:
# لە نامەی دڵدارییەوە فێری نووسین بووم

**سازدانی: هاوکار ئیبراهیم**

مرۆڤێکی تەنیا، ژمارەیەکی براوەی نێو دنیای نووسین و بیرکردنەوە، خاوەنی ڕۆحێکی سەرکەش و یاخی، مرۆڤێک کە ناتوانێت جگەرەکەی بۆ چەند ساتێکیش بکوژێنێتەوە، کەس نییە جگە لە ئەحلام مەنسوور کە ڕەنگە لەم پێشەکییەدا زۆر پێویست بە ناساندنی نەکات، چونکە ئەو لە ڕێگەی نووسینە بەردەوامەکانیەوە کەسێکی ناسراوە، هەروەها ئێمەش لەم دیدارەدا (کە بڕیار وابوو چەند مانگێک بەر لە ئێستا لەگەڵیدا سازی بدەین، بەڵام ئەوسا نەخۆشی ڕێگەی لێ گرت)، زیاتر لەسەر ژیانی تایبەتیی ئەو دەوەستین، چونکە ژیانی ئەو وەک خۆی دەڵێت «ژیانێکی جیاوازە»، بۆیە ویستمان بە پلەبەندیی تەمەنیەوە لە منالّی و سەرەتای ژیانیەوە لەگەڵی بکەوینە گفتوگۆکردن، بەڵام ئەو گوتی «من لە سەرەتای ژیانمەوە دەست پێ ناکەم، چونکە ژیان بریتییە لە ساتەکان، مرۆڤیش لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی تر گۆڕانی بەسەردا دێت، هەروەها حەز ناکەم باسی خۆم بکەم، چونکە لەگەڵ کاتدا ناگونجێم. تەمەنی ساتەکانم ڕێک وەکو تەمەنی پەلکەزێڕینەن، بەڵام پەلکەزێڕینەیەکی گەردوونی. ئیدی نازانم ڕۆحم لە ناو چ ڕەنگێکدا ئارام دەگرێت، بەس ئەوەندە دەزانم کە گرەم دێ بۆ ئازادی. بە داخەوە، ئازادی لەم وڵاتەی ئێمەدا باجی خۆی دەوێت. گەر ئافرەتێک ئازاد بێت، باجی ئازادییەکەی بەردبارانکردنە، منیش لەوەتەی خۆمم ناسیوە،

ئازاد بووم. هەر بۆیەشە ناچمە هیچ ماڵێک، چونکە وەکو «سارتەر» دەڵێت، (ئەوانی تر دۆزەخن). لە ماڵەکەی خۆمدا لە کاتی بیرکردنەوەدا ساتێک لە بەهەشتم، ساتێک لە دۆزەخ، بەڵام گرنگ ئەوەیە درۆ لەگەڵ خۆمدا ناکەم و خۆمم دۆزیوەتەوە.»

ئەو دەیگوت «من سەر بە تەمەنێکی دیاریکراو نیم، هەر بۆیەشە زۆم پێ ناخۆشە و تووڕە دەبم کە ناوی ئافرەتم لێ بنرێت یان کاتێک بە ئەحلام خان یاخود بە خاتوو ئەحلام بانگم بکەن، لەبەر ئەوەی من مرۆڤم، منداڵم، هەرزەکارم، نەوجەوانم، پیرم، گەنجم...» مێژووی نووسین لای هەریەکە نووسەرەکان بە جۆرێک سەری هەڵداوە. ئەو دەڵێت «لە تەمەنی هەرزەکارییەوە و لە نامەی دڵدارییەوە فێری نووسین بووم، ئێستاش کە دەنووسم، لە نووسیندا ستراتیژییەتی خۆمم هەیە. بۆ نموونە، ئێستا کە لە کوردستاندا کە تا ڕادەیەک ئازادیی دەربڕینی بیروڕا هەیە، حەوت ساڵ وەکو بەرد بێدەنگ بووم، بەڵام لە دواییدا تەقیمەوە، تەقینەوەی من ئاسایی نییە، ڕێک لە تەقینەوەی ئەتۆمەکان دەچێت. حەزیش ناکەم لە ڕۆژنامەیەکدا ئیش بکەم کە وەکو (محەمەد بەرادعی) سانسۆری ئەتۆمیی نووکی قەڵەمەکەم بێت، خۆشبەختم کە لە ڕۆژنامەی هاوڵاتیدا دەنووسم، چونکە کارمەندەکانی خوێندکاری خۆم بوون، وەکو تۆ و لە نێو خاکی ڕۆژنامەنووسیدا چاندمن و هەروەها پیتێکیش چییە لە نووسینەکانمدا لای نابەن. جگە لەوەش، من لە نووسیندا جیاوازم لە خەڵکی تر. لای من نووسین پرۆسەیەکی بەردەوامە و دوای مردنیشم بۆ میللەتەکەم دەدوێم. بۆ نموونە، کتێبێکم هەیە کە تایپ کراوە و هەڵەچنی کراوە و لە cdیەکدایە، ئێستا لە کێبخانەی هاوڵاتییە. دوای مردنم چاپخانەی ڕەنج بۆمی چاپ دەکات. من لەم کارەمدا خۆم بە (ژان ژاک ڕۆسۆ) بەراورد ناکەم، بەڵام وەکو گوتم، من جیاوازم و ئەم جیاوازییەشم هەر لە منداڵییەوە دەست پێ کردووە. بۆ نموونە، باوکم ڕێگەی نەدەدام بچمە سەر قەراغی ئەڵوەن مەلە بکەم تا دز و حیز نەبم. بۆیە ناچار خۆم لە ژێر عەبای باجی ئایشەی پاقلەفرۆشدا دەشاردەوە. ئەو بەدەم گۆرانییەوە لیفەکانی ماڵی ڕەشید ئاغای دەشت، منیش لە ئەڵوەندا مەلەم دەکرد.»

ناوی ڕووباری ئەڵوەن یەکسەر خانەقینی بیر هێنایەوە. بۆیە لە ئەحلام مەنسوورمان پرسی خانەقین لە یادەوەریی تۆدا چییە و چی دەگەیەنێت؟ ئەویش لە وەڵامدا گوتی «خانەقین واتە باوەگەزی (قووڵترین شوێنی ڕووباری ئەڵوەن)، ئەڵوەنیش واتە من، منیش واتە ئەڵوەن، خانەقینیش یەعنی هاوڕێیەتیم لەگەڵ لەیلا قاسم، خانەقین واتە ڕەسەنایەتیی کوردستان، خانەقین واتە پردی گەورە کە تانک و زرێپۆشەکانی عێراق نەیانتوانی هەرەس بە کۆڵەکەکانی بهێنن، بەڵام لەمڕۆدا خانەقین یەعنی ماسیی مردووی ئەڵوەن یان بیری وشکبووی مزگەوتی مەجید بەگ.»

کاتێک ئەحلام باسی لە خانەقین دەکرد، خۆشەویستیی ئەو بۆ کوردستان و جێگەی منداڵی لە چاوەکانیدا بەدی دەکرا، بۆیە پرسیاری کۆچمان بۆ دەرەوەی وڵات لێ کرد، ئەویش گوتی «وڵاتی خۆم خۆش دەوێت، هەرگیز ئامادە نیم بەجێی بهێڵم. ئەورووپا و هەموو وڵاتانی گەردوون بێنە بەر دەرگاکەم، یەک سانتیمەتر هەنگاویان بۆ نانێم. چونکە من بە فرێسک سەفەر دەکەم و تک تک دەڕژێمە سەر خاکی نووسین. چارەکێک بەر لە ئێستا لە (عەکا) بووم، دوای نیو سەعاتی تر ماچبارانی هەموو منداڵانی (دارفۆر) دەکەم. دوای کاژێرێکی تریش لایلایە بۆ منداڵێکی ئەفغانی دەکەم. من لە ناو ئاگری شەڕی جیهانیی سێیەمدا دەسووتێم و دەبرژێم، ڕۆحم دەبێتە دوو بەشەوە. ئەم دوو بەشەی ڕۆحم یەکتری دەهاڕن و پاشماوەی هاڕینەکەشیان دەبێتە نووسین. وڵاتی خۆم خۆش دەوێت و بۆنی وشکایی درەختەکانی کوردستان دەکەم. بە ویژدانم ئاویان دەدەم، کەچی خەونەکانم هەمیشە لە فڕندان، ڕێکەوتەکانیش وەکو ئەستێرە بوون بە ملوانکە و لە گەردنم ئاڵاون. ئەی کە برسیمە و حەزم لە نانە و نایخۆم، ئەی کە تینوومە و حەزم لە ئاوە و نایخۆمەوە، ئەی کە خنکاوم و حەزم لە ئۆکسجینە و هەڵی نامژم، چونکە لە گۆشەیەکدا منداڵێک هەیە عەلاگە دەفرۆشێت و خەونێک هەیە لەبار دەچێت و ئافرەتێکی کورد هەیە خۆی دەسووتێنێت، ئافرەتێکی کورد هەیە دەکوژرێت و کەس دەنگ ناکات.»

ئەحلام گەرچی بەردەوام وەکو ئافرەتێکی نەترس داکۆکی لە مافەکانی ئافرەتان دەکات، بەڵام تاکو

## ئەحلام مەنسوور

ئێستا بە شێوەیەکی فەرمی لە هیچ ڕێکخراوێکی فێمینیستیی کوردیدا دەرنەکەوتووە. کاتێکیش ئەو پرسیارەمان ئاڕاستە کرد، لە وەڵامدا گوتی «ڕێکخراوەکان گوویان خوارد کە کاریان لەگەڵدا بکەم. من هەمیشە بڕبڕەی پشتم پرد بووە بۆ هەنگاوەکانی ئافرەتی کورد بۆ ئەوەی لە قەراغی کۆیلایەتییەوە بە سەر پشتمدا بگەنە کەناری ئازادی. لە ساڵی ١٩٧٣وە کە لەگەڵ (شەهید ئارام) لە ڕۆژنامەی هاوکاریدا کارم دەکرد، بابەت فێمێنیستی دەنووسم. (نەوال سەعداوی و جان دارک و ڕۆزا لۆکسمبۆرگ و فەروغی فەروغزاد و ئیزابێل ئەلەندی)م خۆش دەوێت. بە تاقی تەنها دژی کۆیلایەتی و کۆنەپەرستی شەڕ دەکەم. شەڕی منیش جیاوازە لە شەڕی ئافرەتی نێو ڕێکخراوەکان. چونکە فێر نەبووم وەکو تووتی قسە بکەم. لەبەر ئەوەی من ئازادیم لە دەستدایە، نە مێردم هەیە و نە منداڵ. بە تەنیا دەژیم و ئەو تەنیاییەش هیچ کێشەیەکی بۆ دروست نەکردووم. چونکە لە تەنیاییدا گوێم لە دەنگی تایەی عارەبانەی حەماڵەکانی کوردستان و هاواری چلورەفرۆشەکانی نیوەڕۆیانی هاوین دەبێت، یاخود بۆنی کلاشی پێشمەرگەکان و بۆیاغی ناو شووشە و فلچەی مناڵە بۆیاغچییەکان دەکەم، هەروەها لە تەنیاییمدا گوێم لە گرەگری پەرەمێز دەبێت و بۆنی هیسی ساجی ئافرەتە بێوەژنەکان دەکەم. من تا خاک و میللەتەکەم مابێ، تا دەستی زبری بێوەژنانی ئەنفال مابێ، تا بەزموڕەزمی خوێندکارەکانم لە زانکۆ مابێ، هەرگیزاوهەرگیز تەنیا نابم. بۆیە لە هیچ ئافرەتێک ناچم. بەڵام ناشڵێم سیمبولی ئافرەتی ئازادم لە کوردستان و عێراق و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، چونکە هەوڵ دەدەم وەکو با، وەکو زریان، وەکو دەریا و ئۆقیانووس ئازاد بم. بەڵام داخەکەم، تەمەنی ئازادیم وەکو تەمەنی پەپوولەپایزەیە. ژیانیش هەر ئەوەندە هەڵدەگرێت.»

کراوەبوون و تێکەڵاوبوونی ئەحلام لە ناو زانکۆدا لە دیارترین خاسیەتەکانی ئەو مامۆستا میهرەبانەیە کە ڕەنگە کەم مامۆستا هەبێت وەکو ئەو تێکەڵاو بە کۆڕانەکانی خوێندکارانی زانکۆ بووبێ. ئەو تێکەڵاوبوونەش لە زۆرێک لە نووسینەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە. وەکو خۆشی دەیگوت «من دادەی هەموو مناڵانی جیهانم، بە تایبەتیش دادەی مناڵانی کورد، من دایکی هەموو خوێندکار و گەنجێکی کوردم. دەبێت نووسەر تێکەڵاو و میهرەبان بێت لەگەڵ میللەت و ڕۆڵەکانیدا، چونکە میللەتەکەم جوانترین دیاریی پێ بەخشیوم کە ئەویش پێنووسەکەمە. جگە لەوەش، من مۆڵەت و بیرۆکەی نووسین لە کوێوە دەهێنم؟ خۆ لە قنگی دایکمەوە نایهێنم. لە بۆنی شەرابی سەر مێزی سیاسەتمەدارانی کوردیشەوە نایهێنم، یان لە چڵکاوخۆرەکانی دەسەڵاتیشەوە وەری ناگرم، بەڵکو لە میللەتەکەمەوە وەری دەگرم و میللەتی منیش خەونە و لە ئاسماندایە. بڕواش ناکەم ببێتە دووکەڵ.»

ئەحلام تا ئێستا بە هۆی نووسین و ئاخاوتن و گفتوگۆکانییەوە چەندین کێشەی بۆ دروست بووە و چەند هەڕەشەیەکی لاوەکی بۆ حەڵالکردنی خوێنی بوونیان هەبووە، تەنانەت لەم دواییەدا چەند مامۆستایەکی ئایینی خەڵکیان لە ئەحلام هان دا. سەبارەت بەم هەڕەشە پڕ مەرگانە، ئەحلام دەیگوت «هەرگیز لە مردن ناترسێم، چونکە هەزار جار تاقیم کردووەتەوە. ئەگەریش لە خۆیەوە هات، من گونم نییە بڵێم بە گونمەوە. بەڵام پێنووسم هەیە کە وشەی خوێناوی دەبارێنێ. مردن و پێتێکم و وشەیەکم و ڕستەیەکم و ژیانم و پێڵاوەکانم، هەروەها هیچ هەڕەشەیەک ناتوانێت من کپ بکات. سەدام حسێن بەو هەموو زۆردارییەی خۆیەوە نەیتوانی کپم بکات. چوومە کۆشکی کۆماری و وەکو هەورەتریشقە هاوارم لێ هەڵسا و بەسەر سەدامدا تەقیمەوە و پێم گوت نامەوێ ببمە بەعسی و ڕاپۆرتنووس بۆ بەعس، چونکە پێشتر داوایان لێ کردبووم کە وتار بۆ بەعسییەکان بنووسم، بە سەدامم گوت (بە پێی خۆم هاتووم بۆ مردن.

بشمکوژی نە دەبمە بەعسی، نە دەبمە وتارنووسی بەعس. فەرموو بمکوژە.) ئەویش سەرسام بوو بە ئازایەتیی من و وتی چیت دەوێ بۆتی بکەم؟ منیش وتم هیچم ناوێ، تەنها نامەوێ ببمە بەعسی.»

تێبینی: ئەم دیدارە لە ژمارە ٣٤ی گۆڤاری کۆوار، ساڵی ٢٠٠٨ بڵاو کراوەتەوە.

# ئاوارەبوون و دۆستایەتیی هێمنی شاعیر لەگەڵ ئەحلام مەنسووردا

هێمن (سەید موحەمەد ئەمینی شێخەلیسلامی موکری، ١٩٢١-١٩٨٦) ئەوەی کە کەم تا زۆرێ شارەزایی لە ئەدەبی کوردیدا هەبێت، بە دڵنیاییەوە ناودەنگی ئەم شاعیرەی بیستووە و گەیشتووە بەو ڕاستییەی کە هێمن لە ڕیزی شاعیرە هەرە بەرز و مرۆڤدۆست و هەستناسکەکانی سەدەی بیستەمە.
ئەوەی کە گرنگە، ئەوە نییە بێم باسی زۆر لایەن لە ژیان و بەرهەم و هەڵوێست و نیشتمانپەروەریی ئەم شاعیرە بکەم، من کارم بە ئەمە نییە، بە هۆکاری ئەوەی پێنووسی زۆر لە نووسەران و توێژەران بە دەوری ئەم باسەدا خولاوەتەوە، بەڵام ئەوەی کە پێویستە بگوترێ، ئەوەیە هێمن: «شاعیری ئازادی و خۆشەویستی، داربەڕوویەکی هەڵچوو، ڕەگی بە ناو کەندولەندی نیشتماندا ڕۆ چووە، لەسەر ڕیشەیەکی توند بەندە. بە ئەزموونێکی دووردرێژەوە شارەزای دەروونی گەلەکەیەتی، لەگەڵ ئازارەکانیدایە، لەگەڵ چرۆی هیوادا دەژی. لەو شاعیرانەیە کە ناوی نەتەوەکەیان دەکەن نازناوی خۆیان، چۆن کە وتمان (جەواهیری)، دەڵێن: شاعیری گەورەی عەرەب، یان کە وتمان (نازم حیکمەت)، دەڵێن: شاعیری گەورەی

تورک.»

«چەوساندنەوەی گەلی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە لایەن (محەمەد ڕەزا شا)ەوە، لە نیوەی دووەمی سەدەی ڕابوردوودا، گەیشتە لوتکە، بە جۆرێک، بۆ شاعیرێکی وەکو (هێمن) درێژەدان بە ژیان لە سایەی ئەو ڕژێمەدا بوو بە کارێکی قورس و دژوار، بۆیە لە ئاکامدا خۆی دەڵێت: ناچار بە پیری سەری خۆم هەڵگرت و بە داری دەستی ڕووم لە وڵاتی غەریبایەتی کرد و دەستم لە ژن و ماڵ و کەسوکار و یار و دیار هەڵگرت.»١

هێمن لە تەمەنی (٤٧)ساڵیدا، واتە لە ساڵی (١٩٦٨)، زێدی خۆی جێ دێڵێت و ڕوو لە وڵاتی غەریبایەتی دەکات و لە کوردستانی عێراق و بە تایبەتیش (بەغدا) دەگیرسێتەوە و لەگەڵ ژیانی نامۆیی و ئاوارەییدا خۆی دەگونجێنێت.

هێمن نامۆیە: «بەڵام خۆی نەبەستووەتەوە بە مەسەلەیەکەوە، پشتی تێناکات و خۆی دانابڕێ، یاخود لە کۆمەڵ دانابڕێ، خۆیشی ئەندامێکی هۆشیاریەتی، دەیەوێ بوونی گەلەکەی بپارێزێ، شیعری بەرگریی بۆ دەڵێ، کەوابوو، هەمیشە شیعرەکانی نوێ و زیندوون، شیعری نوێیش بۆ هەموو مرۆڤ نوێیە.»٢

بە بڕوای من، ئاوارەیی و دوورکەوتنەوەی شاعیر لە زێد و وڵات و خزم و کەسوکاری خۆی تەنها قازانجێک کە بۆی هەبووبێ و گەیاندبێتیە ڕیزی شاعیرە بەرزەکانی سەدەی بیستەم، لەدایکبوونی چەندین دەقی باڵای داهێنەرانەی ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦٨-١٩٧٨)ە. بەراورد بە ئەوەی شاعیر لە وڵاتی کوردەواریی خۆیی و لە نزیک دۆست و ئازیزان و خزم و کەسوکاریدا دەقی داهێنەرانەی کەمترە. هێمن لە ژیانی ئاوارەییدا ورە لە ژیان بەرنادات، بەڵکو هێشتا ئومێد و ئاسۆی هەیە و لە ڕێی ئەدەبەوە دەیەوێ خزمەتی نەتەوەکەی بکات و لەپێناویدا تێبکۆشێت. بۆیە لەگەڵ زۆرێک لە لاو و شاعیر و ئەدیبە کوردەکاندا، وەکو: (محەمەد موکری، حەمەی مەلا کەریم، د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، کاکەی فەلاح، مستەفا نەریمان، خاتوو ئەحلام مەنسوور، دیلان و کامەران موکری و ...)، ئاشنایەتی و دۆستایەتی پەیدا دەکات کە ئەمە وا لە شاعیر دەکات هەست بە غەریبایەتی نەکات و وەکو وڵاتی خۆی، بەبێ خەم و کەسەر، لە ناو هاوڕێ و دۆستەکانیدا بژی، بەو پێیەی دۆست و هاوڕێکانی جێی خزم و کەسوکارەکەی بۆ دەگرنەوە.

شاعیر لە ساڵی (١٩٧٠)دا لە زۆرێک لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا دەست بە نووسینی شیعر و وتار دەکات و ساڵی (١٩٧٣) لە کۆڕی زانیاریی کورد وەکو ئەندام دەستبەکار دەبێت و خزمەتێکی زۆر بە ئەدەب و فەرهەنگی کوردی دەکات. ناوەناوەیش هاتوچۆی کۆڕی زانیاری دەکات و لەوێ ئەحلام مەنسوور دەناسێت کە ئەو دەمە ئەحلام، لەگەڵ ئەوەی تەمەنێکی کەمی هەبووە و سەرەتای کاری ئەدەبیی بووە، هەر زووش ئاشنایەتی لەگەڵ شاعیردا پەیدا دەکات، ئەحلام خۆی دەڵێت: «ساڵی (١٩٧٤) لە کۆڕی زانیاری، یان دەزگەی ڕۆشنبیری بوو، مامۆستا هێمن پەنابەر بوو لە (بەغدا)، خۆشی ئەندام بوو لە کۆڕی زانیاریی کورد و هاتوچۆی ئێمەی دەکرد. هەرچی شیعری دەنووسی، بۆی دەهێنام، دەیگوت: ئالام، ئەمەم نووسیوە، ئەلان بیخوێنەوە. دەمخوێندەوە، بە بەردەوامی هەفتەی جارێک دوو جار یەکترمان دەبینی. پیاسەمان دەکرد، دەمانخوێندەوە و دەماننووسی. شتی خۆمم بۆ دەخوێندەوە. دەیوت: «تۆ بە (٥٠) ساڵ پێش میللەتەکەی خۆت کەوتوویت. تازە نە تۆ پاشگەز دەبیتەوە لە کێشەی خۆت، لە هەڵوێستە ڕەهاییەکانی خۆت و نە ئەو میللەتەش بە ئاسانی دەگاتە تۆ. هەر جیاوازیتان دەبێت و تا مردن تۆ مەینەتی دەکێشی.»٣

ئەحلام زۆر جار دەیوت تەنها پیاو هەبێ هێمنە و بەس، پیاوی وەکو ئەو جوان لە کوردستاندا دروست نابێتەوە، لێرەوە دەبێت بەدوای ئەو سیفەتانەدا بگەڕێم کە لە شاعیردا هەبوون و وای لە کچێک کردبێت تەنیا عاشقی یەک کەس بێت و هەر ئەو کەسەیش بە پیاو و جوان و مرۆڤدۆست بزانێت کە ئەویش هێمنە.

ئەو سیفەتانەی کە لە هێمندا هەبوون:

١- شارستانی و چاوکراوەیی.

٢- ڕۆشنبیری.

٣- خۆشەویستی بۆ ئافرەتی کورد و ئافرەتی جیهان.

٤- مرۆڤێکی وجودی و سەرووی شوعییەت.

٥- مرۆڤێکی شێوەجوان و ناخجوان.
٦- مرۆڤێکی ئازادیخواز.
٧- مرۆڤێکی یاخی.
٨- نازکێشانی کچانی کورد و بە تایبەتیش ئەحلام.

لە لایەکی تریشەوە، دەمەوێت ئەو سیفەتانە دیاری بکەم کە شاعیر لە ئەحلامدا دۆزیبوونیەوە:
١- چاوێک، شاعیر بۆی دەگریا.
٢- شیوعییەکی گیرفانبەتاڵ.
٣- دڵێک شاعیر بۆی لێ دەدا و لێوێک شاعیر بۆی پێدەکەنی.
٤- خۆشەویستی شاعیر و ئەدیبان، بە تایبەتیش هێمن.
٥- کچێکی کراوە و یاخی.
٦- بێماڵ و بێسامانی و مەینەتیی ژیانی ئەحلام. کە خۆی ئەو ڕاستییە ناشارێتەوە و دەڵێت: «ساڵی ١٩٧٤ مامۆستا هێمن وای دەزانی من لە کۆشکێکی گەورەدا دەژیم و ئۆتۆمبێلم هەیە. ڕۆژێ وتی: ئەحلام با ماڵەکەت ببینم. بەڵێ، چووینە سەر پردەکە و سەیری کۆترەکانمان کرد و گەیاندمە ماڵی خۆم، قاپێکی بچووکی تێدا بوو، دوو هێلکەی تیا بوو، حەسیرێک و بەڕەیەک ڕاخرابوون، پیاڵەیەک بۆ چا! مامۆستا هێمن زۆر سەرسام بوو! وتی: نازدار، تۆ چۆن لەم مەینەتییەدا دەژیت؟! تۆ دەبێ جوانترین خانووت هەبێ. وتم: مامۆستا هێمن، من شیوعیم، لەم ژوورەدا گەورەترین کۆبوونەوە دەکرێ. زۆر خەفەتی خوارد. وتم: مامۆستا هەر مێشکم هەیە، هیچم نییە. زۆری پێ خۆش بوو. لەو ڕۆژەوە زیاتر خزمەتی دەکردم.»٤

ئەحلام و هێمن هێندە پەیوەندیی هاوڕێیەتیان بەهێز و توندوتۆڵ بووە و ئەوەندە ڕایەڵی بیری هاوبەشیان لە نێواندا هەبووە، زۆر جار بوونەتە خەمڕەوێنی یەکتر و ڕاز و حەز و ئارەزووە تایبەتییەکانیان بۆ یەکتر باس کردووە و بۆشاییە دەروونی و تەنیاییەکەی یەکتریان پڕ کردووەتەوە.

ئێستا بۆچوونێکی باو لە ناو ڕۆشنبیران و نووسەران و خوێنەرانی شیعری هێمندا هەیە، کە دەوترێت شاعیر هەردوو شیعری «ماچی خودایی ١٩٧٦» و «یادگاری شیرین ١٩٤٥»ی بۆ ئەحلام نووسیوە. لە شیعری یەکەمدا بە ئاشکرا هەست بە شانۆیی سێکسی دەکرێت. پێم باشە سەرەتا بۆچوون و تێڕوانی هێمن دەربارەی ژن و سێکس وەربگرم کە لەم چوارچێوەدا دەڵێت: «پیاو وەختێک دەتوانێ ژن دەرک کا، کە ئێزدیواجی کردبێ، یانی ژنی هەبێ، ئەو دەمی دەتوانێ دەرکی کا.. پێم وانییە لە دڵداریدا پیاو بتوانێ ئەو تەجروبەیە بێتە دەستی وەکو ژنداریێک هەیەتی..... من پێم وایە دڵداری لەگەڵ سێکسدا پەروەردە دەبێ و دەڕواتە لای سەروو.»

هەر بۆیەش سێکس: «لە بواری ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبیشدا بایەخی پێ دراوە، لەم ڕووەوە لایەنێکی ڕەخنەی ئەدەبی ئەمەریکی جەخت لەسەر سێکس دەکات و بە هێزێکی ئاراستەکەر لە ژیان و بەرهەمەکانی نووسەردا دەیزانێت.»

لێرەوە دەگەڕێمەوە سەر ئەوەی کە بۆچوونی ئەحلام لەبارەی لەدایکبوونی دەقە شیعرەییەکەوە بخەمە ڕوو کە دەڵێت: «من دانیشتبووم لە لای کاکەی فەلاح و مستەفا نەریمان، بە حوکمی ئەوەی کە بۆی بڵاو بکەنەوە، هێمن شیعرەکانی دەهێنا بۆ گۆڤاری (بەیان). من لە ڕۆژنامەی (هاوکاری) بووم. هەر بۆنی مام هێمنم بکردایە، دەچووم لەو مەجلیسەدا دادەنیشتم. بەخێرهاتنم دەکرد و ئەملاولایم ماچ دەکرد و باوەشم پێیدا دەکرد. ڕۆژێ هات وتی: کاکەی فەلاح! ئەم شیعرەم نووسیوە ئەوشۆ، بۆم هێناوی، بۆم بڵاو دەکەیتەوە؟ وتی: بەسەرچاو مامۆستا گیان. لە بەر پێی هەستان و شیعرەکەیان لێ وەرگرت. کە گەڕایەوە، وتی: ئەتۆ دەزانی ئەم شیعرە بەشێکی لەسەر تۆم نووسیوە؟ وتم: با دەزانم وایە. بەرەبەیانییەک هات، سەعات حەوت و نیو بوو، خۆش بووم، وتم: «بەخێر بێی» باوەشم پیا کرد و وتم: «دانیشە ئیسراحەت

بکە.» دووەم ڕۆژ هات وتی: «ماچی سینەمایی»م نووسیوە. یەک بڕگە لە «ماچی سینەمایی» لە خوارەوە باسی من دەکات. کە شووم کرد، ئەم بڕگەیەی کە ناوی خۆمی لەسەر بوو، بڕی.
کە ناوەڕۆکەکەی ئەمە بوو کە ماچی ئەحلام خوداییە و خۆشترە لەو ماچانەی کە لە سینەما دەیبینین. دەڵێ: ئالام و ئەحلام، یەکی کۆتایی بە ئالامی بەژان دێت، ئەوی دیش بە ئەحلامی، بە خەون دێت. کە بەختی خۆی لام بوو».
لێرەوە دەگەم بەو ڕاستییەی کە هێمن شیعرەکەی وەکو دیارییەک پێشکەش بە ئەحلام کردووە، جگە لەوەیش، ئەگەر ورد ببینەوە، دەبینین شیعرەکە تەنها بۆ ئەحلام نەنووسراوە، بە بەڵگەی ئەوەی ئەحلام خۆی دەڵێت هێمن پێی وتم بەشێکی شیعرەکەم لەسەر تۆ داناوە، کاتێکیش کە شووت کردووە، ئەم بڕگەیەم بڕیوە کە باسی تۆی کردووە. سەرباری ئەمەیش، بە پێویستی دەزانم ڕای شاعیر خۆی دەربارەی دەقە شیعرییەکە بخەمە ڕوو، کە دەڵێت: «ماچی کچە سولەیمانییان تێری نەدەکردم بە تەنیا (پێدەکەنێ)، چونکو باوکانە بوو... ماچی سینەمایی ئەو ماچانەن کە وەکو بابێک ئەو خەڵکە منیان ماچ دەکرد. ئەمە ددانپێدانانێکی جوانی شاعیرە بەوەی ئەویش وەک هەر مرۆڤێکی تر هەست و حەز و ئارەزووی هەیە و پێویستی بە دابینکردنیانە، واتا هەر بە تەنها ماچی باوکانە بۆ مرۆڤ بەس نییە، بەڵکو بۆ شاعیرێکی ئاوارە و دەربەدەر و هەستناسکی وەک هێمن (ماچی خودایی)یش، کە بارگاوییە بە چێژێکی سێکسی، دەبێتە پێویستی.»
لە لایەکی تریشەوە ئەگەر سەرنجی دەقە شیعرییەکە بدەین، دەبینین شاعیر (٣٥) جار بە فەرمانی «وەرە» کۆتایی بە دەقە شیعرەکە هێناوە کە بۆشاییە سێکسییەکەی تێدا ڕەنگی داوەتەوە. کە ئەمەیش بۆ ئەوەیە هەستی دەروونی بکەوێتە ڕێژگەی ئەو کێشەوە کە دەیەوێ هەستەکەی پێ دەربڕێ، بەڵام کاتێک زیاتر لە دەقە شیعرییەکە ورد دەبینەوە، هەست دەکەم ئەمە ئەحلام نییە لە شیعرەکەدا، بەڵکو کەسێکی ترە، لە شاعیر دوورە و دەستی پێی ڕاناگات، جگە لەمەیش، شیعرەکە تاسەیەکی خۆسەویستیی بەرزی تێدایە و لە عەشقی گەنجێک دەچێت، نەک پیرێک بۆ ئەحلام. هەر بۆیە وای نابینم ماچی خودایی بۆ ئەحلام نووسرابێ، وەک چۆن (سالم) وەڵامی (نالی)ی دایەوە، ئیتر وترا (نالی) بۆ (سالم)ی نووسیوە، ئاوایش ئەحلام بە ماچکردنی هێمن لە کۆڕێکی شیعریدا، ئیتر خۆی کرد بە خاوەنی ئەم دەقە. ئەوەتا دەردەکەوێت:

**ماچی خودایی**

وەرە یارم، وەرە ئەی تازە یارم!
وەرە ئەستێرەکەی شەوگاری تارم!
وەرە ئەی شاپەڕی باڵی خەیاڵم!
وەرە ئەی شەو چرای ڕووناکی ماڵم!
وەرە خاسە کەوی ڕام و کەویی من!
وەرە ئیلهامەکەی نیوەشەوی من!
وەرە ئۆخژنی سینەی پڕ گڕی من!
وەرە پیرۆزەکەی بەرزە فڕی من!
وەرە ئاونگی سەر پەلکی گوڵی سوور!
وەرە ئاورینگی گەرم و مەشخەڵی نوور!
وەرە ئەی ڕێژنە بارانی بەهاری!
وەرە شیعری تەڕی پڕ وردەکاری!
وەرە ئەی نەونەمامی باخی ژینم!
وەرە ئەی شاگوڵی مێرگی ئەوینم!
وەرە کاروانکوژەکەی کاتی بەیانیم!
وەرە بیرەوەری و ئاواتی بەیانینم!
وەرە ئەی بوت هەتاکو بتپەرستم!
وەرە مەمکۆڵەکەت بگرم بە مستم
وەرە ئەی «خەج»، ئەی «خاتوو زین»م!
وەرە با بەژن و باڵاکەت ببینم!
وەرە با دامرێ ئاوات و تاسەم!
وەرە با بسکەکەت لادا هەناسەم!
وەرە با هەڵمژەم ئەم لێوە گەرمە!
وەرە با هەڵگوشم ئەم ڕانە نەرمە!
وەرە جوانێ، وەرە نازت بکێشم!
وەرە وەک دەستەگوڵ داتنێم لە پێشم!
وەرە با بەس بکەم ئەم باوە باوە!
وەرە با بۆت بکەم ئەو بسکە خاوە!
وەرە با دەست لە باڵاکەت وەرێنم!
وەرە کوڵمەم لە کوڵمەی تۆ خشێنم!
وەرە سوور بە لەسەر وادە و بەڵێنی!
وەرە کوردبە و مەکە پەیمانشکێنی!
وەرە گیانم فیدای چاوی ڕەشی تۆ!
وەرە هەست بکەم گەرمی لەشی تۆ!

وەرە ماچم دەیە ماچی خودایی!
کە بێزارم لە ماچی سینەمایی!

یادگاری شیرین یەکێکی ترە لەو دەقە شیعرییانەی کە دەخرێتە ڕیزی شیعری (ماچی خودایی)ەوە کە گوایە هێمن بۆ ئەحلامی نووسیبێت، کە شاعیر: «لەم شیعرەدا لە ناو چوارچێوە و باسێکی خۆشەویستیدا نیشتمان و گەلەکەی ناخاتە لاوە، بەڵکو هەمیشە لەبەر دەرگای خەیاڵیدا ئامادەن، لەگەڵ هەر دیمەنێکی خۆشەویستیدا، دیمەنێکی لەخۆبوردن و فیداکاریمان دێنێتە یاد. ئەوەتا لەگەڵ برژانگی تیژدا نووکی ڕمی دوژمن باس دەکات، لەگەڵ باسکردنی برۆی وەک شیری خۆشەویستەکەیدا باسی هەژاریتیی لاوی کوردیش دەکات، لەو دێڕەشدا کە باسی چاوی بەخوماری دڵدارەکەیمان بۆ دەکات، هەروەها باسی ئەو ئازار و ناخۆشی و چەوساندنەوەیەمان بۆ دەکات کە شۆڤێنیزمی (تورک) بەرانبەر بە گەلی کورد کردوویەتی.» یادگاری شیرین ناونیشانی شیعرەکە و بە (چاوەکەم چاوی ڕەشی تۆ ئافەتی گیانی منە) دەست پێ دەکات. زۆرێک لە ڕۆشنبیران و خوێنەرانی شیعری هێمن دەڵێن شاعیر ئەم دەقەی بۆ ئەحلام نووسیوە، تاکە بەڵگەیان بە دەستەوە بێت، چاوڕەشبوونی ئەحلامە. پێویستە ئەوە لە یاد نەکەین کە هێمنی هەستناسک ئەوەی لە ئافرەتدا زیاتر سەرنجی ڕادەکێشێت، سیفەتی چاوڕەشییە. کە بێگومان ئەم سیفەتەیش لە چەند دەقە شیعرێکدا ڕەنگی داوەتەوە. بەڵام تەنها گەڕانەوە بۆ مێژووی لەدایکبوونی ئەم دەقە شیعرییە، دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە ئەم دەقەی بۆ ئەحلام نەنووسیبێت، چونکە مێژووی نووسینی دەقە شیعرەکە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٤٥) و لە کۆمەڵەشیعری (تاریک و ڕوون)دا تۆمار کراوە، لەگەڵ ئەوەیشدا پێویستە دیسانەوە ئاماژە بە ناسین و ئاشنایەتیی ئەحلام لەگەڵ شاعیردا بکەم کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٧٤)، لە لایەکی تریشەوە دەگەڕێمەوە بۆ مێژووی لەدایکبوونی ئەحلام کە ساڵی (١٩٥١)ە، ئیتر کەسێک لەدایک نەبووبێت، شاعیر چۆن شیعری بۆ دەنووسێت!

بەڵام بە بۆچوونی من، ئەو ڕاستییەی پێویستە لێرەدا بگوترێ، ئەوەیە هێمن ئافرەتی چاوڕەشی خۆش ویستووە، بێگومان ئەحلامیش چاوڕەش بووە و شاعیریش خۆشی ویستووە و شیعرەکەی لە شێوەی وتندا پێشکەش کردووە، نەک لە شێوەی نووسیندا، وەکو پێشتر ئاماژەم پێ کرد، مێژووی لەدایکبوونی شیعرەکە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٤٥). کە ئەمەیش دەقەکەیە:

یادگاری شیرین

چاوەکەم! چاوی ڕەشی تۆ ئافەتی گیانی منە
گیانەکەم! برژانگی تیژت نووکە ڕمبی دووژمنە
شیری دەستی شێری ئاڵایە برۆ ڕاکشاوەکەت
جەرگی لاوێکی هەژاری کوردی ورد پێ بجنە
دیدەکەی بە خوماری تۆ یورکانە بەدمەستی دەکا
بۆیە مەیلی وا بەکێشە و فیتنە و خوێن ڕشتنە
بەژنەکەت سێدارەیە، کەزیەت تەنافە زوو بە دەی
بیخە ئەستۆی من کە کوردم، کورد بەشی خنکاندنە
زامی جەرگی من بە فەرموودەی گراوی سواری کورد
مەڵهەمی هەر ژەنگی گوارە و ئارەقی بەر گەردنە
ئارەزوومە هیچ نەبێ جارێکی ماچ کەم زاری تۆ
ئارەزووی من چونکە، ئەمما تا بەفرمووی شیرینە
دڵ بە گرمەی تۆپی گەورەی دوژمنیش ڕانەچەکێ
دادەخورپێ ئەم دڵە ئەمما بە خرمەی بازنە
خەڵکی دنیا ڕازی دڵداری بە (بێتەل) پێک دەڵێن
ڕاسپاردەی لاو و کیژی کوردە ئێستاکەش شنە
ڕۆژی بەختی هەر لە ژێر هەورێکی ڕەشدا لاوی کورد
تاکوو ڕوخساری کچی لەپێش چاوان ونە
نایەڵێ گۆشەی برۆکەی دەرکەوێ چارشێوەکەت
ئەی لە دەست ئەو چڵکە هەورە مانعی مانگ گرتنە
چۆن دەبێ سەربەست گەلی ژێر دەست کە کچ

دابەستنەبێ؟
بەس نەبێ ئەو کۆیلەتی و ئەو کچ لەژوور دابەستنە؟!
دەرکی داخستوە لە تۆ بابت کەچی دەرکی نییە!
دەرکە داخستن لە تۆ دەرکی هومێد داخستنە
داڕزینە، مردنە، ئاخر هەتا کەی پێت بڵێن
نابێ بێتە دەر لەماڵ، مافی ژیانی کوا؟ ژنە
لادە چارشێوی ڕەشت با دەرکەوێ کوڵمەی گەشت
چون لە قەرنی بیستەما زۆر عەیبە ئەو ڕوو گرتنە
کیژی خەڵکی بۆمی ئاتۆمی دروست کرد و ئەتۆش
هەر دەزانی ناوی «ئەستێوڵک» و «دەرخۆنە« و «پنە«
فێری زانست و هونەر بوو ئەو لە سایەی خوێندنی
تۆیش تەشیمان بۆ دەڕێسی، یادگاری شیرینە
ئەو بە ئاسمانا فڕی، دنیا گەڕا، چووە بن بەحر
دەک نەمێنم کاری ئێوەش هەر لە ژوور دانیشتنە
کوڕ بەژێنە ئەو لە عیلم و ئەو لە کارو سەنعاتا
گۆرەویشە سەنعەتی تۆ، پێت خەنی بووم بیچنە
ئەو پەچە و ڕووبەند و چارشێوەی نەدیوە نەنکی تۆ
ئەو شڕ و شاڵانە دیاری دوژمنی دڵچڵکنە

کیژی شێخ و کیژی حاجی و کیژی ئاغا ڕەنجەڕۆن
کیژی ئازادە ئەوی ژینی بە نووکی گاسنە
شەنگەبێری یار و دەستباری کوڕی کۆچەر نەبێ
چۆن دەگاتە جێ هەوار و هۆبە ئەو بارگە و بنە؟
قەشڵی دەست و کوڵمی سووتاوی کچی لادێ نەبێ
چۆن دەگاتە دەستی دەسبڕ ئەو هەموو تاتوونە؟
نیسک و نۆک و ماشی ناو عەمباری ئاغای مفتەخۆر
پاک لە سایەی دەسکەنەی «زین» و «ڕۆت» و «سوێسنە«
شۆڕەژن بنکۆڵ نەکا بڕکەی بە قرچەی نیوەڕۆ
چۆن لە کاڵەک تێر دەبێ ئەو زگزلە بێستان ڕنە؟
کوا مەتاعی کوردەواریمان دەچوو بۆ هەندەران؟
گەر بە سەربەستی نەژیبا ئەو کچە ماندووچنە
بیر و هاوێری لەگەڵ کاکی نەکردبا بن پشک
چۆن دەمانبوو ئەو هەموو گۆشت و پەنیر و بەرگنە؟
دەست و کەرکیتی کچی نازداری هەوشاری نەبا
چۆن دەڕازاوە بەقاڵی شار و بازاڕی سنە؟
با هەزار (زێ) و (گادەر) و (لاوێنی) ڕوونیشمان

هەبێ
تاکو ژن ئازاد نەبێ، سەرچاوەی ژن لیخنە
کۆیلەتی باوی نەماوە، کیژی کوردی
خۆ شە و یست !
ڕاپەڕە، هەستە لە خەو، ئاخر چ وەختی خەوتنە؟
دەرکە بشکێنە، پەچە بدڕێنە، ڕاکە مەدرەسە
چاری دەردی کوردەواری خوێندنە، هەر
خوێندنە
دایکی زانایە کوڕی ئازا دەنێرێتە خەبات
من گوتم تۆیش تێبگە «ناگاتە دەریایە زنە«
گوارەکەی زێڕت بەکار نایە، لە گوێ بگرە
قسەم
لایقی گوێی تۆ عەزیزم شیعری سادەی
«هێمنە«
دیارە هێمنی شاعیر: «لەگەڵ ڕووخاندنی ڕژێمی (شا) لە مانگی شوباتی ساڵی (١٩٧٩) دا و هاتنە سەر تەختی ڕژێمی (خومەینی)، کە دیاترین ڕووداوی سیاسی بوو، دەرگای گەڕانەوەی بە ڕووی (هێمن)دا کردەوە و گەڕایەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان و نزیکەی (٧) ساڵی کۆتایی لەوێ بەسەر برد.»

هەڵبەتە گەڕانەوەی شاعیر بۆ زێد و باوەشی نیشتمان و وڵاتی خۆی بۆشاییەکی گەورە لە ژیانی ئەحلامدا دروست دەکات، چونکە ئەحلام پێی وایە ئەم بۆشاییە تا ئێستا ماوەتەوە و هەرگیز بۆی پڕ نابێتەوە. بەگوێرەی ئەوەی جێگری وەکو هێمنی لە ژیاندا دەست نەکەوتووە. بۆیە ئەحلام وەکو مرۆڤێکی ڕاستگۆ لە دواساتەکانی ژیانیدا دەڵێت: «ڕووی ڕۆژگار ڕەش بێت، من دەمنازی بە خۆمەوە، خۆشەویستیم لەگەڵی نەدەکرد، چونکە جیاوازیی تەمەنمان بوو. ئەو (٦٠) ساڵ بوو، من (٢٠) ساڵان بووم. کەچی ئەو منی وەکو عەشق خۆش دەویست. بەڵام ئەگەر ئێستا مامۆستا هێمن ببینم تەمەنی (١٠٠) ساڵ بێت، من دەبمە (١٤) ساڵ و دڵداریی لەگەڵ دەکەم. زۆر پەشیمانم، زۆر. ئای کە خۆشم دەوێ، ئێستایش شەوی وا هەیە بیری لێ دەکەمەوە، هێمن مامۆستای منە، قەرزباری ئەوم.»

**لە کتێبی: ئەحلام یاخییە ئەڵوەنییەکە وەرگیراوە**

ئەحلام مەنسوور

# ئەحلام مەنسور

## خودا، ژیان، چاکە، هەمووی خۆشەویستی و هاودەمییە!

**هاوژینی مەلا ئەمین**

ئەحلام نووسەرێکی بەتوانا، ژنێکی ئازا، مامۆستایەکی باش، هاوڕێیەکی دڵسۆز و جێمتمانە، مرۆڤێکی قەشەنگ بوو، هەمیشە یاخیبوون و سەمای ژیان لە ڕۆحی ماندووی دەباری. دەڵێم ڕۆحی ماندووی، چونکە من بە گەورەیی مامۆستا ئەحلامم ناسی، وەختێک ناسیم کە هەموو ئازایەتی و جوانییەکانی پاشەکشێیان کردبوو بۆ نێو ڕۆح و یادگارییەکانی. وەختێک ناسیم کە کچانی شاری سلێمانی و ناوەندی ڕۆشنبیری و ئەدەبی و تەنانەت زانکۆ و ناوەندی ئەکادیمییش، لەبەر کەموکورتیی خۆی، لە یادەوەریی خۆشیدا نەیدەتوانی بە جوانی و بە ڕوونی جێگەی خانمێکی بەهرەمەند و ماندووی یاخیبوونەکانی بکاتەوە.
ئەحلام کاتێک هاتە زانکۆی سلێمانی، هەڵگری کولتوور و ڕابوردوویەک بوو کە ئیدی بووبوویە جێگەی گومان. لە کاتێکدا کە ئەو، لە پەیوەندیدا بە ئازادی و بەختەوەریی ژنەوە لە سەر لوتکەیەک وەستابوو کە دەیویست سەرمایە کۆمەڵایەتییەکانی ببینرێت، پاشەکشێی کولتووری نەبێتە مایەی ئەوەی کە ئەو نێوەندە قودرەتی قبوڵکردنی لاسارییەکانی ژنێکی ڕۆحسووکی نەبێت!

ئەحلام مەنسوور

حەق بە خۆم نادەم کە وەک نووسەر، وەک ڕۆماننووس، وەک داهێنەرێک باس لە ئەحلام خان بکەم، لەبەر ئەوەی کە خوێنەرێکی باشی بەرهەمەکانی نەبووم، هەروەها لەبەر ئەوەش کە کەسایەتیی ئەو، شێوازی ژیانی ئەو وەک ژنێک، هەڵوێستە بوێر و نووسینە ڕەخنەییەکانی، خودی خۆی بە تایبەت وەک مامۆستایەک، بۆ من گرنگتر دەهاتە پێشچاو. ئەو دڵی خۆی، ئازارەکانی مرۆڤێکی مێیینەی کوردی هەڵگرتبوو و لە دواقۆناغەکانی تەمەنیدا، بە جۆرێک لە بێباکی و نادەربایسییەوە، خۆی بە ئەو نیگەرانییانە سپاردبوو کە لە چاوی هەر خانمێکی ڕۆژهەڵاتیدا دەیبینین!

مامۆستا ئەحلام بە ڕاستی چاوی تیژ بوو، لە دوورەوە، بە سانایی مرۆڤەکانی دەوروبەری خۆی دەناسییەوە و هەستی بە نیگەرانی و ئازارەکانیان دەکرد، هەموو ئەو مرۆڤانەی دەناسی کە بە چاوی گومان و نیگەرانییەوە لێیان دەڕوانی و زۆر جار لەجیاتیی شەڕ، ئاسوودەیی و بێدەنگیی دەفرۆشت!

ڕەنگە گرنگترین شت لە پەیوەندیدا بە کەسایەتیی ئەم خانمەوە، جارێکی دی وروووژاندنی ئەو پرسیارە بێت کە ژنبوون و مێیینەیی چییە، ئەو تایپە لە ژیان و بوون، لە مرۆڤایەتی و ژنبوون کە ئەحلام دەیویست وێنای بکات و لانیکەم لە ژیانی تایبەتی خۆیدا ڕەنگی دابوویەوە. تایپێکی تەواو جیاواز بوو بەوەی کە نەک پیاو، بگرە ژنی ئەم کولتوورانەی ئێمە پێی ئاشنان. ئەحلام لەگەڵ ئەوەی کە هەموو ڕەهەندە کولتووری و کۆمەڵایەتییەکانی کێشەی ژنی دەبینی و ڕەنگە وەک ژنێک و لەبەر ئازایەتی و جورئەتی خۆی، بە ڕوونی ئەزموونی کردبن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێداگریی تەواوی لەسەر ئەوە دەکرد کە کێشەی ژن پەیوەندییەکی قووڵی بە کەسایەتیی وێناکراوی ژن خۆیەوە لە نێو کۆمەڵگەدا هەیە و ئەم وێنەیە سەرباری پەروەردە و کولتوور، ژن خۆی ڕۆڵێکی دیار و سەرەکیی بینیوە لە تۆخکردنەوە و گواستنەوەیدا، هەر بۆیە چارەسەرکردن و پاشەکشێکردنیشی پەیوەندییەکی ڕاستەقینەی بە ئامادەیی کۆمەڵایەتی و دەروونیی ژن خۆیەوە هەیە، بۆ ئەوەی کە لە دەرەوەی ئەو وێنە و وێنایە بژی. مانەوەی ژن لەو دۆخە کولتووری و کۆمەڵایەتییەدا کە تێیدایە، پەیوەندییەکی ڕاستەقینەی بە تەسلیمبوونی خۆی بەو وێنەیە هەیە، تەسلیمبوونێک کە زۆر جار لە شێواندنی وێنەی خۆیدا زیاتر لە هەر شتێکی دی ڕەنگ دەداتەوە. لێرەوە بوو کە ئەحلام زیاتر لە خودی یاخیبوون لەو هەلومەرجانە، گرنگیی بە فۆرمەکان و تایپەکانی ئەو یاخیبوونە دەدا و ئەمە لای ئەو بابەتێکی سەرنجڕاکێشتر بوو لە خودی یاخیبوون خۆی و لە دواقۆناغەکانی تەمەنیدا و پاش ئەزموونەکانی خۆی ئەو زیاتر لەم بابەتە گفتوگۆی دەکرد.

بە داخەوە کە ڕەنگە ئەو خانمە لە دوای خۆی بەرهەمێکی ئەوتۆی لە پەیوەندیدا بەم کێشەیەوە بەجێ نەهێشتبێت کە ئێستا ئێمە بتوانین بگەڕێینەوە سەری، بەڵام تەنها سووسەکردنی بابەتەکە، پاش ئەو ئەزموونە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەی خۆی، لە دیدی منەوە گرنگیی تایبەتی هەیە و دەشێت بۆنەکانی یادکردنەوەی ئەحلام زیاتر لە هەر شتێک، چ لە ڕوانگەی نووسینەکانی و چ لە ڕوانگەی کەسێتی و ژیانی تایبەتی خۆیەوە، بۆ ئەم مەبەستە تەرخان بکرێن و ئەو خانمانەی کە لە ڕۆح و لە ئەزموونی ئەحلام خانەوە نزیکتر بوون، بتوانن لەم بارەیەوە شتی گرنگ بدرکێنن و قسەمان بۆ بکەن.

لە دیدی منەوە و بەرەنجامی هەندێک هاوڕێیەتی و گفتوگۆ و بیروڕاگۆڕینەوە لەگەڵ مامۆستا ئەحلامدا، دەتوانم بڵێم کە گرنگترین ڕەهەندەکانی ئەو تایپە لە ژیان و ژنبوون کە ئەو بیری لێ دەکردەوە، بریتی بوو لە دەرچوون لە کۆی ئەو کێشە و پرس و گرفتانەی کە لە بنەڕەتەوە مایەی سەرقاڵبوونی ژنن بە خۆیانەوە وەک کێشەیەک، کە ئەمە زیاد لە هەر شتێکی دی ئینێرژی و توانای

ژن و وزە شاراوەکانی دەبات و ڕێژەیەکی زۆر لە توانای نواندنی کردە و کارایی لێ دەسەنێتەوە و دەبێتە مایەی ئەوەی کە زیاتر لە کردار، پەرچەکردار بنوێنێ و زۆرتر لە سێبەری تەڵخی وێناکانی کولتوورێکی پیاوسالار و نێرسالاردا پێناسەی بوون و چالاکییەکانی خۆی بکات و دەربکەوێت.

ئەحلام زۆر لەوە نیگەران بوو کە مێینەیی و ژنبوون، کە لە دیدی ئەوەوە نایابی و بگرە ئیمتیازێک بوو، وەک سەرچاوەی کێشە و گرفتێک، بە تایبەت لە دیدی ژن خۆیەوە ببینرێت و لەبری ئەوەی کە سوود لە توانا شاراوەکانی ئەو تایبەتمەندییە ببینرێت، بکرێت یان ببێتە سەرچاوەی کێشەیەک، بە تایبەت لە هەموو ئەو پرۆژانەدا کە ژنان خۆیان بیریان لێ دەکەنەوە. ئەو هەمیشە وا بیری دەکردەوە کە ژنبوون وزە و ئینێرژی و فۆرمێک لە باڵادەستیی ئیستاتیکییە کە نابێت وەک سەرچاوەی کێشە ببینرێت یان لە ململانێ جێندەرییە بێهودەکاندا بە هەدەر بدرێت. ئەوەی کە پێویستی بە ڕزگارکردن و دەربازبوون و سەربەستی هەبوو، لە دیدی ئەحلامەوە، ئەوە نەک ژنی کورد، بگرە خودی ژنبوون و مێینەیی خۆی بوو لە دەست ئەو جۆرە لە بینین کە هەمیشە کاریگەریی خۆی هەبووە لەسەر بەرەنجام و هەوڵەکانی ژنان خۆیان و بزوتنەوەکانی ژنانیش، کاریگەریی خراپی هەبووە لەسەر ئەوەی کە هەموومان بە جۆرێک لە جۆرەکان بێبەری بین لەوەی کە بەهرە شاراوەکانی ئەم بوونە پڕ لە جووڵە و میهرەبانی و بینینە جیاوازە ببینین.

خەمی قووڵی ئەحلام لە دواقۆناغی تەمەنیدا ئەوە بووە کە هەموو ئەو گیروگرفت و ڕێگرییە کولتووری و کۆمەڵایەتییانە و دواجار تەسلیمبوونی ژنی کورد بەو کێشە و وێنانە، هەموویان ببنە هۆی ئەوەی کە ئێمە خاوەنی کۆمەڵگە و کولتوورێکی مەحروم و بێوەری لە ژن و لە مێینەیەتی بین، کۆمەڵگەیەک بین کە مانیفێست و ئەگەرە ڕاستەقینە و شاراوەکانی نێو ئەم ڕەهەندەی بوون نەبینین، بە تایبەت لە دەرەوەی چێوە و پێناسە تەقلیدییەکانەوە، لە دەرەوەی ئەو ڕۆڵە کۆمەڵایەتییانەوە کە بۆ ژن وەک بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی دیاری کراوە و بەشێکی زۆر کەمە لەو ڕۆڵەی کە ژن، یاخود ڕاستر بڵێم مێینەیی دەتوانێت لە ژیان و لە کولتووری ئێمەدا بیبینێت.

# کۆمەڵەچیرۆکی پرد

**غەفوور ساڵح**

بە ڕای من، ئێمەی کورد تاوەکو ئێستاکە کۆمەڵێک چیرۆکنووسی پیاومان هەیە کە هەریەکە و ڕۆڵێکی تایبەتی گێڕاوە و بۆی کراوە کەلەبەرێک لە جۆگەی ئەدەبی چیرۆکنووسیی کوردیدا هەڵبەستێ. کەم تا زۆر هەرکەسە و بەپێی سەردەمەکەی خۆی شتی وتووە و نەوتووە، زۆربەی نووسینەکانیانیش سەبارەت بە کۆمەڵی پیاوی کورد بوون، ئافرەتیش وەکو پەراوێز و هەوێن و ترش و خوێ لە بەرهەمەکانیاندا بەکار هاتووە، ئەوەش تەنها بە ڕەواڵەتی دەرەوەی، نەک ناوەوە. هەروەکو نیگارکێش وێنەی ئافرەتێکی جوانکیلە بە ڕەنگ و بۆیە بکێشێ، وەکو ئادەمیزادێک هەست و ئارەزووەکانی پشتگوێ بخات... ئەنجا ئافرەتیش وەکو خوشک و دلّدار و ژن و هاوڕێی و دایک و ئەو ئادەمیزادە سەیر کراوە کە هەزاران بڕە و بەچکەشێر و پڵنگی کێوان و دەریا و بیابانەکان و زانا و بلیمەت دەخاتەوە و پەروەردە دەکات.

بۆ دەبێ ئافرەت لە مافی ڕەوای مرۆڤانەی خۆی بێبەش بکرێ وا هەردەم بە چاوێکی سووک و نزمەوە سەیری کراوە و هەست و نەست و خولیا و ئارەزووەکانی پێشێل بکرێ... هەر وەک بێکەس دەڵێ:

نەسرین دەمێکە داخت لە دڵمە
گیرۆدەی بەندی ژیانت زوڵمە
وا من پێت ئەڵێم چونکە لەسەرمە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە چی وادەی شەرمە

جا ئەو چیرۆکنووسانەی کە تا ئێستا چیرۆکی ئافرەتی چەوساوەی کوردیان گێڕاوەتەوە، هەروەکو وتمان، لە بەرەی پیاوان بوون و هەمووش چەشنی کەسێکی نێرینە بیریان لە ئێش و ئازار و باری دەروونیی ئافرەتێک کردووەتەوە... ئەمەش زۆر جیاوازە لەوەی کە ئافرەتێکی چیرۆکنووس بەسەرهات و گیروگرفت و ململانێی ڕۆژانە و هەڵچوون و خولیای دەروونیی ئافرەتێک دەربڕێ، ئەم کارەش گەلێک سەرکەوتوو و شیاوتر دەبێ لەوەی پیاوێک... بگرە تاوەکو ئێستا ئەو ئافرەتە چیرۆکنووسانەش کە هەمانن، ئەوانیش کەم تا زۆر سەبارەت بە ململانێ و زۆرانبازی و گوزەرانی پیاو چیرۆکیان نووسیوە و هەمان ڕچەیان گرتووە، بگرە ئەقڵیان بەسەر سۆز و دەروون و پێداویستییەکانی ژیانی تایبەتی خۆیاندا نەشکاوە، ژمارەی ئەمانەش ناگەنە ژمارەی پەنجەی دەستێک... ئەوەی چیرۆکنووسە پیاوەکانیشن، ئافرەتیان وەکو ڕەگەزێکی تەشویق بۆ ڕوونکردنەوەی ڕوانگەیەکی تایبەتی بەکار هێناوە... یاخود وەکو هاندەرێک بۆ خەباتکردن و نارەزایی و بەرگریکردن، هەمیشەش چمک و دامێنی کرۆکی چیرۆکەکە بووە، زۆر جاریش پەراوێز و بۆ گونجاندنی مەبەست لە بارتەقای چیرۆکەکەدا وەکو ئامێرێکی جۆشێنەر بەکار هێنراوە... یان ئەگەر بە دەگمەنیش پاڵەوانی سەرەکیی چیرۆکێک بووبێت، ئەوا تەنها بۆ مەبەستی دڵدارییەکی ڕۆمانسییانە بووە و هیچی دی. ئەوەیشی لە بیر چووەتەوە کە ئافرەتی کورد دیلی پیاوە لە کۆمەڵێکی کلۆڵ و دیل و دەستەوئەژنۆ و دەستەپاچەدا...

«ئەم ئێوارەیە کە بە شەقامەکەدا دەهاتمەوە بۆ ماڵێ، هەتاو بەقەد ژمارەی تیشکەکانی سێبەری بۆم دروست کرد، نەمدەزانی کامیان سێبەری ڕاستەقینەی خۆمن...؟ ڕەنگە هەموویان... نەخێر هیچیان سێبەری من نەبوون... نەمزانی چی بوو هانی دام و لە خۆمم پرسی، ئەرێ سێبەر لە چییەوە دروست دەبێ، یانی مادەی سێبەر چییە... بۆچی تەنها دوو (بوعدی) هەیە... دیارە و دەبینرێ، کەچی هیچ کەڵکێکی نییە... ڕەنگە ئافرەتی کوردیش سێبەر بێ... پیاوان تەنها بۆ حەسانەوە پەنای بۆ بەرن!!»(١).

لە شارێکی کوردنسێنی وەکو خانەقین، شارێکی زمان کوردی شێواو و کەمبڕشت «مەبەستم لە زمان کوردی شێواو و کەمبڕشت ئەوەیە کوردەکانی ئەو دەوروبەرە بە شێوەی لوڕی نیمچەئارەوی قسە دەکەن کە زۆر جیاوازە لەگەڵ شێوەی سلێمانی و شارەکانی تر»، کچە کوردێکی چاوقایم و جەربەزە و سەربەست و نەترس و کوردیزان و زمانپاراو و خزمەتگوزاری وشەی کوردی و هونەرزان و شۆخوشەنگ و ڕۆژنامەنووسی وەک «ئەحلام مەنسوور»ی پەروەردە کردووە، هەروەهاش مامۆستا عەبدوئەلمەجید لوتفیی ئەدیبی گەورەی عیراق، گەرچیش مامۆستا لوتفی نووسینەکانی بە زمانی عارەبین، بەڵام بە لای منەوە بە ئەدیبێکی کورد لە قەڵەم دەدرێ، چونکە لە زۆر بوار و هەڵوێستیدا کوردانە خۆی دەرخستووە و لەم ساڵانەی دواییشدا خەریکی نووسینە بە زمانە زگماکەکەی، هەروەکو لە دانیشتنێکدا ئەمەی دەرخست...

هەروەکو وتمان، ئەم کیژە چیرۆکنووسە لە شاری خانەقین لەدایک بووە، خوێندنی زانکۆی لە کۆلیجی ئەدەبیات، بەشی کوردی تەواو کردووە. سەردەمێکی زۆریش ڕۆژنامەنووس بووە، ئێستاکەش فەرمانبەرێکی وەزارەتی کشتوکاڵە لە شاری بەغدا...

ئەم باسە کورتەمان سەبارەت بە دەنگی ئافرەتی چەوساوەی کوردە لە چیرۆکەکانی «ئەحلام مەنسوور»دا. ئەم جارەش پتر لەو چیرۆکانە دەکۆڵمەوە کە بە کۆمەڵێکی خنجیلانە و قەشەنگ بە ناونیشانی «پرد»ەوە بڵاو کراونەتەوە، کە دەزگای

ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی بە چاپی گەیاندووە. ئێستاکە لە بازاڕدایە بۆ بەر دڵ و دەروونی خوێنەری کورد و «١٨» کورتەچیرۆکی لە خۆی گرتووە...

١- فەقێ عەباس و دیمەنێکی لەیادنەچوو.
٢- گوناهەکانم یەکتری دەسووتێنن.
٣- پەیکەر.
٤- شەو.
٥- کەمان.
٦- لە گۆڕستاندا.
٧- سەرەتایەک بۆ نووسینێکی نوێ.
٨- بە بێدەنگی مرد.
٩- منالّمان ناوێ.
١٠- چارەنووس.
١١- جارێکی تر بە پەڕۆ ڕەشەکە هەردوو چاومیان توند بەستەوە.
١٢- یاداشت.
١٣- پرد.
١٤- خەوێکی هێمن.
١٥- بێدەنگییەکی هەمیشەیی.
١٦- چاویلکە.
١٧- کورتەچیرۆکێکی ناتەواو.
١٨- گۆشەیەکی ژیانی ڕەعنا...

ئەحلام مەنسوور

لەبەر کەمدەرفەتی، نەمتوانی ئەو چیرۆکانەی تری وە چنگ بهێنم کە چیرۆکنووس کاتی خۆی بڵاوی کردوونەتەوە، تاوەکو باسەکە تێروتەسەل بکەین و بتوانین مافێکی ڕەوا و چەسپاوییان پێ ببەخشین و شتێک بە شتێک بکەین، ئەگەر ئەم جارەش نەمتوانی، ئەوا لە دەرفەتەکانی تردا ئەم ئەرکە قورسەکەی سەرشانمان وەکو ڕۆشنبیرێکی کورد ئەنجام دەدەین، یان ئەوەتا کەسێکی دیکە وەکو ڕەخنەگرێکی لێهاتوو و بێلایەن شیتەڵیان دەکاتەوە و دەیانخاتە جێگەی ڕاستەقینەی خۆیان، چونکە ئەمەی من تەنیا بۆچوون و ڕوانگەی تایبەتی خۆمن و هیچی دی...

مامۆستای ئەدیب، «تەها بابان» لە موحازەرەیەکدا کە بۆ لێدوان لەسەر هونەری چیرۆک تەرخانی کردبوو، دەڵێ: چیرۆکەکانی «ئەحلام مەنسوور» نموونەی چیرۆکی زاتین لە ئەدەبی کوردیدا... هەرچەندێ بەش بە حاڵی خۆم ئەم موحازەرەیەم بە کاسێت گوێی لێ بووە، بەڵام بە تەواوەتی مێژووی ڕۆژی بەستنەکەیم بە یادم نایەتەوە، بۆ ئەوەی پتر قسەکەمان لە جێی خۆیدا بێت و دیزەبەدەرخۆنە نەبێت، بەڵام هەر نە ئێستا... منیش ئەوە نییە تەنها بدەمە پاڵی ئەم ڕایەی مامۆستا «تەها بابان»، بەڵکو دەڵێم ئەم جۆرە چیرۆکانەی کۆمەڵەی «پرد» بێوێنەن، نەک لە ئەدەبی کوردیماندا، بگرە لە ئەدەبی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و تا دەگاتە ئەدەبی جیهانییش. من بەش بە حاڵی خۆم، تەنها دوو نموونەم بەرچاوکەوتووە، ئەوەش لە دوو شاکاری جیهانیی نەمردایە کە جووتەخوشکی «برۆنتێ»، «شارلۆت و ئەمیلی برۆنتی» نووسیویانە... ڕۆمانی «بەرزاییەکانی ویزرینگ» و «جەین ئێر»... دەشێ نموونەی تری هەبن کە بەرچاومان نەکەوتوون، بەڵام لە ئەدەبی کوردیماندا کەسێکی ئەو جورئەت و زاتەی نەکردووە بە ڕاستی و ڕەوانی چیرۆک بە جۆر و شێوازێکی داچۆڕاو و بە سەلیقە دابڕێژێ، ئەگەر بێت و ئەمەش لە لایەن ئافرەتێکی کۆمەڵێکی هەرە دواکەوتووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە بێت... ئەوەی شایانی باسە ئەو دوو ڕۆمانە ناودارە «بەرزاییەکانی ویزرینگ» و «جەین ئێر» کاتێک کەوتنە بازاڕەوە، دەیان ڕەخنەی توندیان لێ گیرا و بە دوو ڕۆمانی «نائەخلاقی» درانە قەڵەم و جووتەخوشکی برۆنتیش سەدەها توانج و قسەی سووک و تەشەریان ئاڕاستە دەکرا... پاڵەوانی ئەو جووتە ڕۆمانەش ئافرەتی چەوساوەی توندکراوی نێوان چوار دیوارن کە نەریت و ئایین گشت ڕێگەیەکی لێ بەستوون. وەکو هەموو ئادەمیزادێکی دیکەی ئازادی کۆمەڵ هەست و ئارەزووی ڕاستەقینەی خۆیان دەردەبڕن، دەچنە گژی هەموو نەریت و داب و دەستوورێکی چەوت و ناپەسەندی کۆمەڵایەتیی دژ بە مافی ڕەوای ئافرەت، پەردە لە ڕووی هەر عەیب و شوورەیی و ناکەسبەچەییەک

هەڵدەماڵن... ئەمە ئەوە بووە کە ئەخلاقییەتی کۆمەڵگەی ئەوسای ئەورووپا بۆی هەزم نەدەکرا و یاسای کڵێسەش ببووە قەمتەر و گشت ڕەفتارێکی دوور و نەگونجاوی ئەوساکەی زیندەبەچاڵ و لغاو دەکرد، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەم دوو شاکارە ئەدەبییە تا ماوەیەکی درێژخایەن بەدناو بکرێن... بەڵام پاش ئەوەی هەندێ لە ڕەخنەگرەکان گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە دوو بەرهەمی تازەبابەتن و دەبێ ڕێزیان لێ بگیرێ... ئەوە بوو جووتەخوشکی «برۆنتێ» پێیان وتراوە «خوشکە ئازیزەکان» و بگرە بووە نازناوێک بۆ ئەم جووتەخوشکە ئەدیبە و جووتە بەرهەمە نایابەکەیانیش کەوتنە بازاڕەوە و باوەشیان بۆ کرایەوە، هەروەها وەرگێڕرانە سەر زۆربەی زمانەکانی دونیا... مەبەستیش لە هێنانەوەی ئەم نموونە ئەوەیە چونکە «ئەحلام»ی چیرۆکنووس هەندێ شتی تازەی لە چیرۆکەکانیدا وتووە و بەبێ هیچ ترس و لەرز و خۆگوشینێک، بگرە خۆی وەکو قارەمانێکی هەموو چیرۆکەکانی خۆی دەخاتە ڕوو، دەشێ زۆر کەسی بیرتەسک و کەمبینا بۆی هەزم نەکرێ...

***

«ئەو دەمەی بیر دەکەمەوە لەو ئەرکەی کە هونەرمەند خۆیی بۆ تەرخان کردووە، ئەویش ڕووتکردنەوەی ئەو بەهایانەیە کە لە ئارادان، دەبێ لە ئاژاوەی دەوروبەرەکەی لە خۆیەوە ڕژێمێک دروست بکات، تۆوی تێکۆشان و ناڕەزایی بچێنێ، تاوەکو بە هۆی بەرەڵڵاکردنی عاتیفەوە مردوان بۆ ژیان دەگەڕێنێتەوە، ئەوسا کە بە پیری ئەو کەسە مەزن و کەمنموودانەوە دەچم، شڵەژاوییان مەزنیم زیندوو دەکەنەوە، ورتەورتەکانیان وەکو مۆسیقایەکی خوایانە لە گوێمدا دەنگ دەدەنەوە.»(٢)

هێنری میلەر

***

کۆمەڵەچیرۆکی «پرد» دەنگی هەناسەساردی و ناڵە و نزا و خۆشەویستی و بێدەنگی و خەون و بێدەسەڵاتی و دڵەکوتێ و ترس و سەرکوێرکردن و ڕژانەوە و خەمخواری و ورووژاندن و سەرکوتکردنی هەست و ئارەزووەکانی ئافرەتی چەوساوەیە کە لەژێر ڕکێف و دەسەڵاتی کۆمەڵدا دەناڵێنێ و لە بچووکترین مافی ڕەوای خۆی بێبەش کراوە، ئەویش مافی هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانی و وەکو مرۆڤێک بیر بکاتەوە لە دواڕۆژی خۆی، نەوەک چەشنی شوێنکەوتە و یەدەگ... چیرۆکنووس ئەمەی بە شێوە و شێوازێکی تازە داڕشتووە و مۆرکێکی هونەریی تازەی لە چیرۆکەکاندا بەکار

هێنراوە،... زۆر جاریش «ئەحلام»ی چیرۆکنووس خۆی وەکو ئافرەتی کۆمەڵێکی جەنجاڵ و پرزەبراو، بووە بە قارەمانی چیرۆکەکانی، ئەمەش کارێکی جەربەزە و لەبارە، یاخود وەکو کامێرایەک ڕووداوەکانی بە ئەمانەتەوە نیشان دەدات... پتر توانیویەتی لە مێشک و دڵ و دەروون و ناسۆریی ئافرەتی کورد بگات و دڵشکاوییەکانی بخاتە ڕوو...

زۆر جار قارەمانی چیرۆکەکان ئافرەتی هۆشمەند و ڕۆشنبیر یاخود نیمچەڕۆشنبیرن و مرۆڤانە بیر دەکەنەوە، هەمیشە خۆیان ڕادەپسکێنن بۆ ئەوەی خۆیان لە بیرتەسکی و کوتوپێوەندەکانی کۆمەڵ ڕزگار بکەن و ببنە خاوەنی قەوارەی مرۆڤایەتیی خۆیان... ئەنجامی ئەم خۆڕاپسکاندنەش تووشی سۆفیەتی و وجودیەت دەبن و بێدەنگ و دەروونجەنجاڵیان دەکات، دووچاری خۆکوشتن دەبن، یاخود بە شێوەیەکی تراژیدییانە کۆتایی بە ژیانیان دێت...، ئەم ئەنجامانەش پتر شانۆگەرییەکانی «گارسیا لۆرکا»مان بە یاد دەخاتەوە کە دەنگی خوێن دەبێتە تاکە دەنگ و هەموو دەنگەکانی تر دەپۆشێ... ئەوەتا چیرۆکی «فەقێ عەباس و دیمەنێکی لەیادنەچوو» لە شێوەی درامایەکی شەکسپیرانەدا کۆتایی پێ دێت، پتر قاڵبێکی تراژیدییانەی هەیە، گەرچی چیرۆکنووس بەرامبەر ڕووداوەکان هەندێک دەستەوەستانە و بە جۆرێکی واقیعییانەتر ڕێگەی بۆ پاڵەوانەکان نەکردووەتەوە، هەر وەک بڵێی ڕووداوەکە دەقاودەق نووسراوەتەوە، بێ ئەوەی شوێنپەنجەی چیرۆکنووسی پێوە دیار بێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە نەیویستووە کەسانی چیرۆکەکە ببنە داشی دامە و بە ئارەزووی خۆی جێگۆڕکێیان پێ بکات، بگرە جڵەوی بۆ ڕووداوەکان شل کردووە تاوەکو خۆیان شوێنی ئاوەڕۆی خۆیان بکەون... «عەباس» بۆ نانپەیاکردن و گوزەران بەرەو خانەقین دەڕوا و دەبێتە فەقێی مزگەوتەکەی گەڕەکی «مەلیحە»، ئەویش کچی بێوەژنێکی پاقلەفرۆشە،

ئەحلام مەنسوور

گیرۆدەی خۆشەویستیی یەکتر دەبن و تا دێت خۆشەویستییەکەیان جۆش دەسەنێ، پاش دوو ساڵ ئەم داوی دڵدارییە پڕ جۆشوخرۆش و پیرۆزە بە چەقۆکەی «مچە قەساب» دەپسێنرێ و بە پارچە زێڕێک و ٢٠٠ دینار مەلیحە بە «مچە» دەدەن بە مێرد و عەباسیش ڕەنجبێوەر دەمێنێتەوە... پاش ئەوەی «مەلیحە» بە بێدڵی و ناڕەزامەندیی خۆی بە مێردی دەدەن، عەباسیش وەکو شۆڕشگێڕێکی بیرتەسک و بێبنەما دەکەوێتە گێژاوی عاتیفە و هەڵەشەیی خۆیەوە. بڕیار دەدا «مچە»ی هاوڕێی بکوژێ تاوەکو کاری بەمێرددانەکەی «مەلیحە» هەڵوەشێنێتەوە، دەنا چ چارەسەرێکی تری لە بەردەمدا نەماوە، چونکە کۆمەڵەکەی لە بارودۆخێکی دواکەوتوودایە، ئەندامەکانی لە جوغزێکی تەسکدا دەسووڕێنەوە و ژیانی مادی گشت ئەخلاقییەتێکیان لە بیر دەباتەوە... هەروەها چ دەرفەتێکی لە پێشدا نییە، جگە لە پەنابردنە بەر کردەوەیەکی خۆکوژانە... «تەقەی دەمانچەیەک هەموو دەنگەکانی قووت دا، بووکەکەش پەلەخود بوو» (٣)... بەڵام ئەو گوللەی بە «مچە»وەی دەنێت، بەر «مەلیحە» دەکەوێت... «عەباس بە دەمانچەکەیەوە لە سەربانی مزگەوتەکەوە هاتە خوارەوە. هەموو خەڵکەکە ڕایان دەکرد و لە دەمانچەکەی دەستی دەترسن، گەیشتنە ئەو شوێنەی خوێنەکەی مەلیحەی لە سەر بوو، ڕاوەستا و ڕووی لە ئاسمان کرد و دەمانچەکەی نا بە کەللەی خۆیەوە... کەوت.» (٤)، ل ٢٢.
تەکنیکی چیرۆکەکەش لە شێوەی مونتاژی زیرەکانەدا بەکار هێنراوە. چیرۆکنووس چەشنی وێنەگرێکی سینەمایی لێهاتوو، دیمەن و شوێنەکانی ڕووداوی دەوروبەرەکەی وێنە کێشاوە، لە زۆر شوێندا بە شێوەیەکی درامیی سفت و خەست دارێژراوە و پتر شاعیرانەیە و دەستڕەنگینی پێوە دیارە...
«جیکەجیکی چۆلەکە هەڵنیشتووەکانی سەر تەلەکانی کارەبا و ئاوازی دەهۆڵ و زوڕنا تێکەڵ ببوون...
* مناڵانیش لەگەڵ ئاوازی دەهۆڵ و زوڕناکەدا شانیان هەڵدەتەکان...
* دەنگی شاباش دەهۆڵ و زوڕناکەی ڕادەگرت.
* وردە هەتاویش بەرەو ئاوابوون دەچوو.
* دەنگی تەقەی دەمانچەیەک هەموو دەنگەکانی قووت دا، بووکەکەش پەلەخود بوو و چۆلەکەکانیش هەموو هەڵفڕین...» (٥).
هەروەها چیرۆکەکانی «چارەنووس»، «مناڵمان ناوێ»، «جارێکی تر بە پەڕۆ ڕەشەکە هەردوو چاومیان توند بەستەوە»، «کورتەچیرۆکێکی ناتەواو»، «خەوێکی هێمن»، «پرد»، «گۆشەیەکی ژیانی ڕەعنا» نموونەی ئافرەتی چەوساوە نیشان دەدەن کە لە دونیای پیاودا هەمیشە لە زۆرانبازیدایە بۆ بەدەستهێنانی مافی ڕەوای خۆی و دۆزینەوەی قەوارەی مرۆڤانەی، هەروەها هەوڵدان بۆ بەشداریکردن لەگەڵ پیاودا بۆ بونیادنانی دواڕۆژێکی تازە و بەختەوەر... یاخود بەگژاچوونی ئەخلاقییەت و نەریتی کۆمەڵایەتیی چەوت سەبارەت بە چارەنووسی ئافرەت... ئەوەتا کچە قارەمانی چیرۆکی «چارەنووس» ڕووبەڕووی کۆمەڵێک یاسا و کوتوپێوەندی خێڵەکی دەبێتەوە کە دەیانەوێ ئافرەت وەکو شتومەک ئاڵوگۆڕ بکرێت و چەشنی کەلوپەلێکی بازرگانی هەرزانفرۆش بکرێ بەو کەسانەی شایستەی بیرکردنەوەن... لە لایەکەوە دایکی کچە «دەیەوێ شانازی بە نرخی شووکردنمەوە بکات و لە ناو پیرەژنە گەوجەکاندا خۆی هەڵکێشێ و باسی دیاری و زێڕ و دینار و وەزیفەی زاواکەی بکات...»(٦) لە لایەکی تریشەوە لە ناو کۆمەڵدا سەرپاکی ژیانی لێ دەکەن بە کۆمەڵێک پرسیار و دەبێ هەر شوو بکات و چارەنووس ڕەت ناکرێتەوە، ئەگەرچیش ئەم چارەنووسە بەبێ ڕەزامەندیی ئەو بێت... «ئەرێ تۆ کەی شوو دەکەی؟» «نسیب.. خوا دەزانێ... خۆت ناڵێی شوکردن قسمەت و نسیبە.»(٧).
چیرۆکی «مناڵمان ناوێ» وێنەیەکی دیکەی چەوساندنەوەی ئافرەتە لە لایەن کۆمەڵ و پیاوەوە. ئەوەتا «نەسرین» لەبەر ئەوەی مێردەکەی داوای لێ دەکات منداڵی نەبێت، مناڵەکەی لەبار دەبات، چونکە ئەم داواکارییەی مێردەکەی بۆ منداڵنەبوون ئەوە دەگەیەنێ ئافرەت وەکو ئامێرێکی ڕابواردنە، تا هەر کاتێک ویستی، دەستبەرداری ببێت و تووڕی بدات، تاوەکو منداڵەکەیش نەبێتە وەسیلەیەک بۆ پێکبەستنەوەیان... یاخود دووەم ئافرەتی چیرۆکەکە خۆی دەسووتێنێ لەبەر ئەوەی منداڵی نابێت، گەرچیش بەدووی مێردەکەی کەوتووە و بەبێ ڕەزامەندیی کەسوکاری شووی پێ کردووە...

دیسان چیرۆکی «جارێکی تر بە پەڕۆ ڕەشەکە...»، «چاویلکە»، «پرد»، «یاداشت»، «خەوێکی هێمن»، «کورتەچیرۆکێکی ناتەواو» و «بێدەنگییەکی هەمیشەیی» لە یەک باس و کێشە دەدوێن، لەم چیرۆکانەدا پاڵەوانە ئافرەتەکە دەکەوێتە مشتومڕ و ململانێی و بگرەوبەردە و دیسانەوە پەرژینێ لە نێوان بیروباوەڕیاندا دروست دەبێ، «دلێر» بە هەمان بیرکردنەوەی نیمچە دیکتاتۆریەتی خۆی دەیەوێ ڕچەی بیرکردنەوەکانی بشکێنێ و بیکاتە یەدەگ و شوێنکەوتەی خۆی، بەڵام ئەو جۆرە هەوڵ و تەقەلا ساردوسڕانە لە ئاستی ئافرەتێکی چاوقایم و بڕوابەخۆبوودا چ کەڵکێک ناگرن... «دلێر» کە پاڵەوانە پیاوەکەی ئەو چیرۆکانەیە، هەندێ جار مێردە و هەندێ جاریش دڵخواز و هاوڕێ، بەڵام لە هەرسێ حاڵەتەکەیدا هەریەکن و دەیانەوێ ئافرەتەکە بکەنە یەدەگ و شوێنکەوتەی خۆیان و هەمیشە بە چاوێکی نزمەوە تەماشای دەکەن...

«گەر لێم بدات ئەقیژێنم... ئەگەرچی باوەڕم بە قیژەقیژ نییە... بەڵام ئافرەتی کوردی قوربەسەر چی بکات؟ چیی لە دەست دێ؟ بە قەپان هەوای دەدەنێ، بە ڕاستە و پرگاڵ جووڵەکانی دیاری دەکەن، لە هەزار بازنەی هەندەسیدا حەشاری دەدەن... سەیرە باوەڕیشی پێ نەکەن... ئەوا من دەزانم براکەم چەند درۆ و فرت و فێڵ لەگەڵ ئەم ئافرەتە بەستەزمانانەدا دەکات، هەر ناوێرم هیچ بڵێم، چونکە یەکسەر دەڵێ: (من پیاوم...).»(٨)

پاڵەوانە ئافرەتەکانی کۆمەڵەی «پرد» زۆر جاریش ئافرەتی ڕۆشنبیر و سەرکێش و بڕوائەستوورن... ئەوەتا لە چیرۆکی «گوناهەکانم یەکتر دەسووتێنن»دا ئەم چیرۆکە پارچەپەخشانێکی سفت و بەپێزە و بە زمانێکی بەتوانا و باوەڕئەستوور نووسراوە، دەربەستی ئەوەش نییە هەموو گوناهەکانی مرۆڤایەتییش بخەنە ئەستۆی. بەدووی ئەو کەسەدا وێڵە کە وشەکانی بۆ دەکاتە لایلایە و تاوەکو ئەویش لە هەویری برین و فرمێسکەکانی کەرەستەیەکی بەپێز دروست بکات کە خێربەخش بێت بۆ ئادەمیزاد، چ ئەگەر ڕۆمان، چیرۆک، یان پارچەنووسراوێکیش بێت... هەمیشە لەگەڵ گەورەبوونی گوناهەکانیدا، سنگی ئەو دەبێتە کەشتی و برژانگەکانیشی دەبنە سەوڵ بۆ پەڕینەوە بەرەو جیهانێکی نوێی تر و دوور لە برسێتی و ئەشکەنجە و ئازار و کرۆزانەوە و خوێنڕشتن... گوناهەکانی باڵدارن و بەرەو ئاسمانی پاک و بێگەردی دەڕۆن... بۆیە دەیەوێ ددان بە گوناهەکانیدا بنێت، گەرچیش بێگوناهە. چونکە تەنها گوناهی ئەو ئەوەیە ئافرەتی کۆمەڵێکی دواکەوتووە... دداننان بە گوناهدا خۆی لە خۆیدا ڕێبازێکە بۆ تەحقیقکردنی زاتی مرۆڤانەی خۆی... چونکە ئەمیش وەکو کەسێکی ڕۆشنبیر و هۆشیار بووە بە ئاوێنەی کۆمەڵەکەی و هەموو گوناهەکان لێوەی سەرەتاتکێ دەکەن...

«گوناهەکانم لە دەرگای هەموو مزگەوتێ دەدەن، شێخ عەبدولقادری گەیلانی، ئەبوو حەنیفە، عەتار، ڕۆمی، عەلی... کەچی لە بێدەنگی زیاتر هیچ نابیستن.»(٩)، بۆیە لە ئەنجامدا: «خۆیان بڕیاریان دا خۆیان بسووتێنن.»(١٠)

هەروەها قارەمانی چیرۆکی «شەو»، ئەگەرچی وەکو کەمەلکێش بەدووی «ئامە ڕەش»ی دایەنیەوەیە و ئێستاش وەکو سێبەر لێی نابێتەوە، چونکە «ئامە ڕەش» وەکو پاشماوەیەکی سەردەمی ڕابوردووی کۆمەڵەکەی ئالوودەی تلیاک بووە و لەگەڵ خوێنەکەیدا دەژێت... ئامە ڕەش و شەو دوو هێڵی هاوتەریبی دونیای کۆمەڵایەتیی ئافرەتن، یەکتر دەزێنن و یەک کەمەندکێش دەکەن... بەڵام سەرەڕای ئەوەش، دەیەوێ کەرەستەیەک لە تاریکیی ئەو شەوەیش دروست کات، بۆ ئەوەی مناڵە ڕووتەکانی ئەم دونیایەی پێ بپۆشێت...

یاخود کچەقارەمانی چیرۆکی «کەمان» وەکو ئەوانی تری پاڵەوانەکانی کۆمەڵەی «پرد»، ئافرەتێکی هۆشمەند و ڕۆشنبیرە، سەراپا ئێش و ژان و نەزیف و فرمێسک و بێدەنگی و برینە، هەزارها پرسیاری قۆقزی مرۆڤایەتیی بە کوڵەوە

ئەحلام مەنسوور

گرتووە، بە هەموو کۆڵان و شەقامەکانی دونیادا دەیانگەڕێنێ و لەگەڵ هەموو ئازار و برسێتی و قاوقیژ و دەردەسەری و عارەق و سندوقی مناڵە بویاغچییەکان و ژیانی ڕۆژانەی ماڵەکانی سنەک و بەغا و غەوس و چواردەوری ئەبوو حەنیفە و جنێد و ڕۆمی و عەتار و حەلاج و مزگەوتی سلێمانی و چاخانەی کوێرەکانی قەڵای کەرکوک و ئەڵوەنی خانەقین و کچۆڵە پێپەتی و هەژارەکەی گەڕەکەکەیان و تا دەگاتە گۆی زەوی، بە یەکەوە دەبەستێ و لە گلێنەی چاوەکانی خۆیدا دەیانپارێزێ و بە ڕۆژ دەیانسووڕێنێتەوە، تاوەکو هەتاوێکی تر دەدۆزێتەوە، هەست بە ماندووبوون ناکات، گەرچیش دڵنیایە کە بەم زوانە ئەو هەتاوە بە دەست ناهێنێ، بەڵام هەروەکو «سیزیف» ورە بەرنادات... ئەم هەموو ڕازونیازەش بە گوێی ئامێری کەمانێکدا دەچپێنێ، کە لە سەر مێزەکەی بەردەمی لە ژوورە تەنیاکەیدا ئۆقرەی گرتووە... بەڵام سەرەڕای ئەم هەموو هۆشیاری و خۆخواردنەوە و موعاناتە، ڕووبەڕووی ژیانە پڕ لە ڕۆتین و پرسیارەکان دەبێتەوە، هەوڵ دەدرێ کەمەندێکیش بکرێ و مرۆڤایەتیی خۆی لە دەست بدات و هەروەکو کچی عالەم شوو بکات، بەس ببێتە خاوەن مێرد و مناڵ و ببێتە مرۆڤێکی میکانیکی... بەڵام ئەمیش سەرکێشە و نایەوێ وەکو دەستەخوشکەکانی تری، بە پیاو و ئۆتۆمبێل و پارە هەڵخەڵەتێ و خۆی فڕێ بداتە نێو ژیانی وشک و میکانیکیی دەوروبەرەکەیەوە، چونکە گەیشتووەتە ئەو قەناعەتەی کە بەختیاری لە ژن و مێردایەتیدا لە مسۆگەرکردنی پێداویستییەکانی ژیاندا نییە، بگرە لەیەکگەیشتن و دروستکردنی خۆشەویستییە... ئەم مەرجەش لە کۆمەڵێکی دواکەوتوو لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە هەرگیز بەدی نایەت، چونکە نەریت و عادات و ئەخلاقییەتی کەسانی کۆمەڵ بەوانەوە بەندن... ئەوەتا ئافرەتە دراوسێکەیان بە ڕەوەیەک مناڵەوە، گشت شەوێکیش مێردەکەی بە سەرخۆشی دێتەوە، یاخود ئەو ئافرەتەی لە چیرۆکی «خەوێکی هێمن»دا وێڵ و سەرگەردانە و لە شەوێکدا هەندێ پیاو هەڵی دەخەڵەتێن و ئاوارەی کۆڵان و شەقامەکانی دەکەن، یان «نازەنین»ی خوشکی کچەقارەمانی چیرۆکی «چارەنووس» کە هەموو ڕۆژێک لەگەڵ مێردەکەیدا دەبێتە دەمەقاڵێیان و دەتۆرێ، چونکە ژن و مێردایەتییان ئەنجامی چاوبازییەکی سەرپێی دەبێت و مێردەکەیشی بە هەزار قەرزوقۆڵە و دەستبڕین مارەییەکەی پەیدا دەکات... هەزارەها ئافرەتی دی کە بە بێدڵی خۆیان و هۆیەکی بازرگانی بە مێرد دراون... بۆیە زۆربەی پاڵەوانە ئافرەتەکانی چیرۆکەکان لەو تەجروبەیە دەترسن...

«ئای کەمان...

چەند بێناز لە سەر ئەم مێزەی بەردەممدا ئۆقرەت گرتووە... تۆیش دەروونت وەکو من پڕی پرسیارە و دەتەوێ من ئاسا پرسیارەکانت تووشی نەزیفت بهێنن؟ تۆ بە ناڵە و من بە خوێن... من بەرەو خوار خوێنم دەبێتە تاڤگە و تۆیش بەرەو ژوور ناڵەت دەبێتە گەردەلوول... نازانم تۆیش بێزار دەبی...

تۆیش وەکو هەموو کەسێ دەتەوێ ناڵەی تەلە بەسۆزەکانت دەرپەڕێنی و خەڵکی تر گوێگرت بن... نازانم هەندێ گوێم لێ دەگری، باشە گەر گوێم لێ بگری، باسی چیت بۆ بکەم؟
* ئەوانەی پێستیان ڕەنگاوڕەنگە...
* ئەوانەی لەگەڵ پێگرتنیان ئەرکی بەخێوکردنی خێزان لە ئەستۆیانە...؟
* ئەوانەی درۆ دەکەن و شەوان لە شەقام و بارەکاندا جگەرەی تاک دەفرۆشن؟
* ئەوانەی لە بەرچاویاندا باوک و برا و دایکیان کوژراون، ئەوانەی (صليب الاحمر) نان، شیر، ئاویان، دەداتێ؟
* ئەوانەی باوک و دایکیان هەژارە و دەیانفرۆشن؟»(١١)

دیسانەوە لە چیرۆکی «سەرەتایەک بۆ نووسینێکی نوێ»دا ڕووبەڕووی ئافرەتێکی ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووس دەبینەوە کە تووشی هەمان گێرەوکێشە و ڕۆتین دەبێت و ناتوانێ خۆی لەو کۆتوپێوەندە قورسانەی دەوروبەرەکەی ڕزگار بکات، هیچی لە دەست نایەت تەنها بیرکردنەوە و خەمخواری نەبێت، لەبەر ئەوەی ئافرەتی دەوروبەرێکە کە لە دونیای پیاودا هیچ دەسەڵاتێکی تێدا نەماوە بۆی و هەمیشە بە هۆی قسە و توانج و واتەواتی خەڵکییەوە ناتوانێ خۆی ڕزگار بکات، سەرەڕای ژیان ڕۆتینەکەی:

هەموو ڕۆژێ! (بەیانیتان باش، چۆنن، تەنوورەکەت جوانە، تەسریحەی پرچەکەت... دایلی فڵان، ئەرێ کچەکەتان چۆن بوو... لە دواییشدا ئەگەر بە نووکە قەڵەمێ، چیایەک نەکەن بە نیسک، ئەوا نیسکێ دەکەن بە پیرەمەگروون، بەرتیل و ڕیایی و ملیۆنروویی و پینەکردن.»(١٢)

یان ڕووبەڕووبوونەوەی پرسیارە هەمیشەییەکەی دایکی: بۆ شوو ناکەیت...؟ بەڵام ئەم قسانە لەمەڕ ئەو پشتگوێ دەخرێ، چونکە مەسەلەکە ململانێی نێوان دوو سەردەمی جیاوازە، نێوان ڕابوردووی دواکەوتوو و ئێستای پڕ لە ئاڵوگۆڕی ناوخۆیی و دەرەکی، بۆیە مل بۆ توانج و بۆڵەبۆڵی دایکی ناخەوێنێ و هەمیشە لەگەڵ سەرکێشیی خۆیدا ڕێگەی گرتووەتە بەر و دەیەوێ بە نووسینیش بێت، زاتی مرۆڤانەی خۆی تەحقیق بکات... «دایکم ڕاست دەکات، زۆر دەنووسم، بەڵام چی دەنووسم یا چیم نووسیوە، نازانێ هەرچیم نووسیوە، نرخی لاپەڕەیەکی دۆستۆیڤسکی و ئەندریە جێد و کونستانتین و جۆیسی نییە، ئەگەرچی پێم دەڵێن: سەرەتای نووسینەکانی جۆرج ساند و ڤێرجینیا وۆڵف و فروخزاد وەکو تۆ بووە...»(١٣)

١٩٨٠ بەغدا

پەراوێزەکان

١- کۆمەڵەچیرۆکی پرد.
٢- مجلة الاداب الاجنبية.
٣- کۆمەڵەچیرۆکی پرد.
٤- کۆمەڵەچیرۆکی پرد.
٥- کۆمەڵەچیرۆکی پرد.
٦- کۆمەڵەچیرۆکی پرد.
٧- هەمان سەرچاوە.
٨- هەمان سەرچاوە.
٩- هەمان سەرچاوە.
١٠- هەمان سەرچاوە.
١١- هەمان سەرچاوە.
١٢- هەمان سەرچاوە.
١٣- هەمان سەرچاوە.
١٤- قضايا الرواية الحديثة.
١٥- الموسوعة الصغيرة، صنعة الرواية، ترجمة: سامی محمد.
١٦- موحازەرەیەک دەربارەی چیرۆک لە سلێمانی (تەها بابان).
١٧- عشر روايات خالدة. سومرست موم.

ئەحلام مەنسوور

# ئەحلام مەنسوور: ژنە یاخییەکە لە سیستمی کۆمەڵایەتی

**سمکۆ محەمەد**

یاخیگەریێتی ئەو چەمکە فرەمانایەیە کە لە ڕووی ئایدیاییەوە گوناهێکە دژ بە موقەدەسی کۆمەڵگە و لە ڕووی ماتریالییشەوە وەڵامدانەوەیەکە بەو دژانەی کە لە هەناوی خۆیدا ماناکانی خۆی بەرهەم دەهێنێتەوە. ئەمە ڕووە گشتییەکەیەتی، لە ڕووە تایبەتەکەشیەوە (نەفی)کردنی هەموو ئەو پێوەرە ئەخلاقییانەیە کە یاخیبوونە لە خودی ترادیسۆن کە گشت کاری پێ دەکات. یاخیگەریێتی لە دەرەوەی چەمک، حاڵەتێکە دەتوانین وەکو ئامرازێک بۆ دژایەتیکردنی سیستم بەکاری بهێنین، بەڵام لە شوێنێکی دیکەدا فۆرمێکی تر وەردەگرێ و دەبێتە ئامانج. ئەم ناکۆکی و جیاوازییە ڕەنگە لە نێو دیوی ناوەوەی زۆر تاکی دیکەدا خۆی مەڵاس دابێت، بە تایبەتی تاکی کوردی کە هیچ زەمانەتێکی کۆمەڵایەتیی نییە بۆ ئەوەی بە قەناعەتەوە مومارەسەی ئەو شێوە بیرکردنەوەیە بکات کە هەڵی بژاردووە.

بۆیە ئەم پێشەکییەم بۆ قسەکردن لەسەر ئەحلام نووسی، چونکە ناکرێ باسی یاخیگەریێتی بکەین و پێناسەیەک بە دەستەوە نەدەین، هەروەها ناکرێ ئەحلام وەکو هەر کاریکتەرێکی چالاک و یاخی و ناباو وەرنەگرین. خۆ ئەگەر ئەو حاڵەتانە لەبەرچاو نەگرین کە بەشێک بوون لە شێوەی بیرکردنەوەی ئەو،

ئەحلام مەنسوور

کە ڕەنگە هەندێ جار بە بێئاگایانەش ئینتیمای بۆ ئەو چەمکانە هەبووبێت. بەهەرحاڵ، من کە ماوەیەکی زۆر لەگەڵ نووسین و فەزای بیرکردنەوەی ئەحلام هەڵم کرد و لە نزیکەوە هەم چیرۆکەکانیم خوێندووەتەوە و هەم نووسین و هەم سەرپەرشتیی نووسینەکانیم کردووە، لەو پرۆسەیەدا هەستم بە دوو کەسایەتی کردووە لە دونیای ئەحلامدا، کەسایەتییەکی یاخی لە هەموو جۆرە موڵکیەتێک و کەسایەتییەکی دیکەی سوودگەرا بە ئاڕاستەی کەڵکوەرگرتن لەو شتانەی کە لە ڕووی غەریزییەوە ئینسان دووچاری پارادۆکس دەکەن کە حەزی لە موڵکیەت بێت. ڕەنگە هەردوو حاڵەتەکە بۆ ژنێک کە لە نێو جەنجاڵیی ژیانی کۆمەڵایەتی و بەرتەسکیی بیرکردنەوەدا لە کوردستان ژیان بگوزەرێنێ، مافی خۆی بێت حەزەر بکات لەو ڕێچکەیەی هەڵی بژاردووە کە دژی هەموو ڕەوتەکانی دیکەی کۆمەڵگە بوو، بۆ ئەمەش پێویستی بەوە هەبوو کە لە شوێنێکی دیکەدا وەکو کەسێکی سوودگەرا خۆی نیشان بدات، تاکو بارەکەی هێندەی تر قورس نەبێت، یان لانیکەم بتوانێ بەرگری لەو فەزایە بکات کە تایبەتە بە خۆی، لە ڕوویەکی دیکەشەوە، چاونەترس بوو لە بەرامبەر ئەو دڵڕەقییەی کۆمەڵگە بەرامبەر کەسی یاخی هەیەتی.

### یاخیبوون لە خێزانەوە بۆ تاکگەرایی

دەرچوون لە خێزان و بە تەنها ژیان کارێکی زۆر ئەستەمە بۆ تاکێک لەگەڵ کۆمەڵگەیەکدا بژی کە مانای مافی تاکێتی بە ئینسان ڕەوا نابینێ، تا ئەو ڕادەیەی کە نەفرەتی بەدواوەیە، نەفرەت لە خێزانەوە بگرە تا دەگاتە نەفرەتی کۆمەڵگە و ئایین و ترادیسیۆنێک کە لەجیاتیی بەهای ئینسانی، ئەخلاقێکی دروستکراو دەکاتە پێوەر بۆ تاکێکی قایل و ملکەچ بە ژیانی تەقلیدی، نەفرەتێک کە بێشومار ژنی کوردی کردووە بە قوربانیی ترادیسۆن و پێوەرە ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگە بۆ خێزان. ئەوەی ئەحلام مەنسوور دەخاتە ئەو چوارچێوەیەوە، ئەو یاخیگەرێتییە بوو کە لە ڕەتکردنەوەی خێزانەوە دەستی پێ کرد، ئیدی خێزانی یەکەم کە باوک و دایک و برا و خوشک بوو، خێزانی دووەم کە هەڵبژاردنی ژیانی هاوسەری بوو. ئەمەیە کە لە سەرەتاوە باسم کرد، وەکو ئامرازێک بۆ هەڵبژاردنی شێوەژیان یاخی بوو، ئەمە بۆ ئەو سەرەتایەک بوو بۆ خۆبارهێنان لە ڕەتکردنەوەی پێوەرەکان و هەموو جۆرەکانی ترادیسۆنی کۆمەڵایەتی و ئایین، بە تایبەتی بۆ تاکی مێینە کە دژوارە ژیانی تەنهایی هەڵبژێرێت و دوور لە هەموو کەسە نزیکەکانی، لە شارێکی گەورەی وەکو بەغدا بزر نەبێ.

هەڵبژاردنی ژیانی تاکێتی شکاندنی سنوورێکی واقیعییە کە حوکمی خێرایی و خاویی لێکترازان لە هەموو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان وەکو مەحاڵێک دەخاتە بەردەم تاک. ئەمە تا ڕادەیەک جورئەتی دەوێ، چونکە ڕەتکردنەوەی خێزان، بۆ ئافرەتێک کە جگە لە ئەدەبەکەی بیروباوەڕیشی پێشکەوتنخوازانە بوو، بۆیە تەنها جێهێشتنی چەند کەسێکی نزیک و چوار دیواری ماڵێک نەبوو، بەقەد ئەوەی جێهێشتنی دونیایەک بوو کە تێیدا کۆمەڵێک یادەوەریی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە و کۆمەڵێک یادەوەرییش پووچەڵ دەکاتەوە کە لە ئاییندەدا دەبوو تۆمار بکرێن. بۆ ئەحلام مەنسوور ئەمە پێنتی یەکەمی هەنگاونان بوو بەرەو ڕێگەیەکی پڕ مەترسی و دژوار، ڕێگەیەک کە جگە لە مەترسیی قەبوڵنەکردنی لە لایەن کۆمەڵگەوە، تا قەبوڵنەکردنی لە لایەنی سیاسی و فکرییشەوە، هەروەها ڕەتکردنەوەی ئەو حەز و ئارەزوانەی کە هەر ئینسانێک خاوەندارێتییان دەکات و بریتین لە ئیحساس و غەریزەیەکی سروشتی، بەڵام پاڵنەری ئەو هەڵبژاردنە تەنها وەڕسبوون نەبووە لە دەوروپشت، بەقەد ئەوەی وەڕسبوونێک بوو کە لۆژیکێکی لە پشتەوە بوو، یان ئەوەی پرنسیپێکی فکریی لە پشتەوە بوو، بۆیە توانیی بەرگری بکات و تاکو دواوێستگەی ژیانی، بە ئەزموونەکانیشیەوە

که پڕ بوون له شکست، بەردەوام بوو و پەشیمان نەبووەوە. بەو پێیەی ئەزموونی واقیعی لە گۆڕانکارییەکانی ژیانی ئەحلامدا هیچ گۆڕانکارییەکی نەخولقاند لە کەسایەتی و نیشاندانی دیمەنی پەرچەکردار لە چەشنی نەخۆشیێکی دەروونی. یان ئەوەی کە بیستوومانە یان بینیومانە، کەسایەتییەک لە دواساتەکانی تەمەنیدا لە بیروڕاکانی پەشیمان دەبێتەوە، بە پێچەوانەوە، ئەحلام لەو سکەیە لای نەدا کە گرتبوویە بەر. بەڵام ئەحلام قوربانییەک بوو کە بە دەروونێکی گەورەوە شوێنەواری سەدەها ژنی لە جەستەی خۆیدا هەڵگرتبوو، ئەو پێی وابوو ڕاستە کۆمەڵگە دڵڕەقە و بکوژە، بکوژیش ژیانی تاکەکان لەناو دەبات، بەڵام ناتوانێت واقیعی بوونی ئەو تاکە ناباوانە لەناو ببات کە بوون بە بەشێک لە یادەوەری و مێژووی کۆمەڵگەیەک. بە تەنیایی ژیان و کارکردن لە کۆڕێکدا کە بەشی زۆریان نێرینە بوون، نەترسان لە بەکارهێنانی موفرەدەی قورس بەرامبەر موقەدەساتی کۆمەڵگە و هەڵبژاردنی فەزایەکی پڕ لە ئازادی، هەموو ئەمانە ئەو کارێکتەرەیان دروست کرد کە ناوی ئەحلام مەنسوور بوو.

**یاخیگەرێتی لە نووسیندا**

نووسین لەگەڵ ئەوەدا کە بەرپرسیارێتییە هەم لە ڕووی مەعریفییەوە و هەمیش لە ڕووی ویژدانییەوە، بۆ خۆی بەشێکیشە لە یاخیگەرێتی. ئەوەی کە ئەحلام لە نووسەر و هونەرمەندە مێینەکانی دیکە جودا دەکاتەوە، ئەو گوتارە ڕاستەوخۆیە بوو کە لە پشت تێکستەکانیەوە ڕاوەستابوون و بەبێ پەردە و شەفافانە قسەی لەسەر ئازادبوونی ژن دەکرد، ڕەخنەی لە ژیانی بەکاڵاکردنی ژن لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا دەگرت، ئەو لە کۆمەڵەچیرۆکی (پرد)ەوە کە لە سەرەتای هەشتاکاندا بڵاوی کردەوە، پێنتی دەستپێکردنی یاخیگەرێتیی لە نووسیندا ڕاگەیاندبوو بەبێ ئەوەی لە ڕووی فکرییەوە هیچ پشتگیرییەک لە تیۆرە فکرییەکان وەربگرێت، بەبێ ئەوەی هیچ کام لەو ژنە ناسراوانە بناسێ کە لە دونیای ئەدەبی جیهانیدا سیمبوڵی ئەم بیرۆکەیە بوون، جگە لە سیمۆن دی بۆڤوار، بەڵام چاونەترسانە و ڕاشکاوانە ئەو دیوە شاراوانەی باس دەکرد کە ژنی ڕۆژهەڵاتی و بە تایبەتیش ژنی کوردیان تێدا زیندانی کرابوو.

ئەحلام مەنسوور

بۆیەش قسە لەسەر مەسەلەی ژن دەکەم لە لای ئەحلام، چونکە ئەو پێی وابوو کەلێنێکی گەورە لە بزووتنەوەی نوێخوازیی ئەدەب و پێشکەوتنی کوردیدا هەیە کە بەبێ ڕزگاربوونی خودی ژنان لەو مەهزەلە بەشەرییە، بەبێ سنوورشکاندنی کۆمەڵایەتی و بەشداریکردنی ڕاستەوخۆی ژن لە سیاسەتدا، ئەو کەلێنە پڕ نابێتەوە.

جیاوازیی بیرکردنەوەی ئەحلام لەگەڵ نووسەر و چیرۆکنووسە ژنەکانی دیکەی کورد کە هاوزەمانی ئەو بابەتیان دەنووسی و بڵاویان دەکردەوە یان لە دونیای ئەدەب و هونەری کوردیدا ناسراو بوون، ئەوە بوو کە ئەو لە پەنای نووسینەوەی ژیانی کورد لە نێو جەنجاڵیی نەریتێکی دواکەوتوانەی بێمافیدا، هەروەها تێکەڵکێشکردنی لەگەڵ فەنتازیای ئەدەبیدا، ئامانجی نووسینەکەی دیار بوو کە شێوەهاندانێکی ژنان بوو دژ بەو ترادسیۆنەی کە تەگەرەیە لە بەردەم ئازادییە هەمەلایەنەکانی ژنان، گوتاری پشت تێکستەکانی ئەحلام، لەگەڵ ئەوەدا ئاشکرا بوون کە هۆشیاریی هەمەلایەنە و ئاگایی پێوە دیار بوو، هەروەها بەبێ نووسینەوەی هیچ بەیانێک، مانیفێستێکی ڕاستەوخۆش بوو بۆ ئازادبوونی ژن لە کۆتوبەندی کۆمەڵایەتی و ئایینی و تەنانەت پەراوێزخستنی ژنان لە فەزای سیاسیدا، خۆی بە پێشەنگی ئەو بزووتنەوەیە دەزانی، بەڵام بە هۆی شازبوونیەوە کەسێک نەبوو کۆمەک بەو فکرە بکات و بە هەمان ستایلی ئەو ژیان بکات، بۆیەش زۆر لە خەمی ئەوەدا بوو کە کۆمەڵگە هەمیشە لە پاشەکشەدایە.

ئەحلام لە ڕۆمانی (ئەڵوەن)دا هەموو پاڵەوانەکانی یاخی کردبوو لەو فەزا داخراوەی کە ژیانی لۆکاڵی بەسەر ئینساندا سەپاندبووی. هەموو ئەو بیرۆکانەشی کە واقیعی بوون، لەو کەسایەتییانە وەری گرتبوون کە بەشێک بوون لە ئیدیۆمە کۆمەڵایەتییەکان و ئەو لە زاری دایکی یان باوکی یان کەسە نزیکەکانیەوە بیستبوونی یان وەری گرتبوون. ئەوەش کە بە چاوی خۆی بینیبوونی، لە ڕۆمانەکەیدا ڕاستەوخۆ ئەو ڕۆڵەی پێ بەخشیبوون، سەرباری هەموو ئەوانەش کە دەتوانین وەکو جۆرێک کاری سۆسیۆلۆژی تەماشایان بکەین، ئەدیبێک یان ڕەخنەگرێک یان خوێنەرێکی بەسەلیقە نەبوو خوێندنەوە بۆ ئەو ستایلە بکات کە سکێچی ژیانی کۆمەڵایەتیی کوردی بوو. مەبەستم لەوەیە کە ئەحلام لەبری ئەوەی ئیدیۆمەکان بنووسێتەوە، کەڵکی لە فەزا و کارەکتەرەکان وەرگرتبوو بۆ پاڵەوانی ڕۆمانەکانی.

**گوتاری یاخیگەرێتیی کلاسیکییانە...**

سەدەی بیست بۆ ڕۆشنبیری کوردی، سەدەی کاریگەریی ئەو چەمکە ئەدەبی و سیاسییانە بوو

کە لە ڕۆژئاواوە دزەیان دەکردە نێو ئەدەبیات و نووسینی کوردییەوە، بە تایبەتیش ئەو چەمکە ئەدەبی و فکرییانەی کە لە فەرەنساوە دەهاتن، بەو پێیەی کە پاریس بەرهەمهێنەری ئەو چەمکانە بوو کە پەیوەندییان بە مرۆناسییەوە هەبوو، ئەحلام مەنسوور دوای ئەو هەموو ڕێگرییەی بۆ تەواوکردنی خوێندن، لە زانکۆی بەغدا خوێندنی تەواو کرد، لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا بە مەبەستی خوێندن لە بواری ئەکادیمیادا دەچێتە فەرەنسا و لەوێ لانیکەم بە ڕۆشنبیری ئەو سەردەمەی ڕۆژئاوایی ئاشنا دەبێت. هەڵبەت بۆ ئەو سارتەر و سیمۆن دی بوڤوار نموونەیەکی بەردەست بوون بۆ ئەوەی بتوانێ قسە لەسەر یاخیگەرێتی لە نووسیندا بکات، بۆیە کاریگەریی فکری سارتەر و سیمۆنی زۆر لەسەر بوو، بە تایبەتیش فکری فێمێنیزم کە ئەو بەبێ باکگراوندێکی تەواو فکرییانە مومارەسەی دەکرد و خۆی بە پێشەنگی ئەو فکرە دەزانی. لە لای ئەو پێوەرێک هەبوو: ئینسان نابێ ڕاستگۆ نەبێ لەگەڵ خۆیدا، تەنانەت مەرج بوو لە نێو تێکستەکانیشیدا ڕەنگ بداتەوە، بەبێ لەبەرچاوگرتنی هونەری نووسین و ئیستاتیکا و گوتاری ناڕاستەوخۆ، بۆیە زۆر جار دەکەوتە بەر ڕەخنەی ئەوەی کە لەژێر کاریگەریی ئیدیۆلۆژیادا دەنووسێ، بۆیە نەیتوانیوە ئەو دەقە بشکێنێ و ئینتیما بۆ بزووتنەوەی نوێگەرێتی بکات کە ستایلێکی نوێی ڕۆماننووسیی بەرهەم هێنابوو. بەڵام ئەو پێی وابوو ئەمە مانای یاخیگەرێتییە و دەبێ تێکست زوو مانای خۆی بە دەستەوە بدات و بەرهەمیش هەر ئەوە ماناکەیەتی، هەر بۆیە وەڵامی ئەو ڕەخنە نوێگەرییەی پێ نەبوو کە لە نێو دونیای مۆدێرنی ئەدەبیاتدا بەرهەم هاتووە و فەزای نووسینی گۆڕیوە.

پاڵەوانی چیرۆکەکانی ئەو بە ڕادەیەک بەرجەستە بوون و واقیعی بوون کە لە گفتوگۆی ڕۆژانەدا ئاشکرای دەکردن، تا ئەو ڕادەیەی تەماشاکردنی بۆ زەمەن و کاتیش واقیعییانە بوو، نەک ئەوەی خەیاڵێک بێت بۆ ئەو پاڵەوانەی کە ئەو گەرەکیەتی گەمەیان پێ بکات و ڕۆڵیان پێ بدات تاکو لە خەیاڵدانی خوێنەردا فەزایەک بخولقێنێ. ئەو قەناعەتەشی نەبوو پاڵەوانەکانی بکات بە کۆیلەی تێکستەکانی، هەر بۆیە هەمیشە پاڵەوانەکانی ئازاد و بڕاوە چاونەترس بوون، تەنانەت لە موناقەشە و گێڕانەوە دەربارەی ئیدیۆمی زێدی خۆشی کە خانەقین بوو، هەمان ئەو پاڵەوانانەی باس دەکرد کە لە خەیاڵیدا بوون بیانکات بە پاڵەوانی چیرۆکەکانی. (تاوسە) ئەو ژنە یاخییە بوو کە هەمیشە باسی دەکرد و گوایە بە منداڵی بینیویەتی، ئەم ژنە پێشتر لە خانەقین بووە و بە هۆی بێکەسییەوە هاموشۆی نێوان خانەقین و کرماشانی کردووە و خەنە و کەرەستەی جوانکاریی ژنانی هێناوە و دەیان جار ڕووبەڕووی مەترسی بووەتەوە، لە حاڵێکدا کە ئەم پاڵەوانە لەگەڵ پیاوان کاری قاچاخچێتیی کردووە، بەو پێیەش بێت کەسێکی لەڕادەبەدەر یاخی بووە لە ترادیسیۆن. بۆیە ئەحلام زۆر سەرسام بوو بەو یاخێتییە و کردبووی بە پاڵەوانی نموونەیی خۆی. بیانووشی بۆ ئەمە ئەوە بوو کە شانۆکانی سارتەر و نووسینەکانی سیمۆن هەمان پاڵەوانی واقیعییان هەیە، بۆیە ئەمیش بە هەمان ستایل کاری دەکرد. ئەحلام هێندە سەرسام بوو بەو ژنانەی کە توانیبوویان بەبێ پیاو بژین و نموونەکەشی تاوسە بوو، دوای ماوەیەکی دوورودرێژی ژیانی تەنهایی لە بەغدا و شەوانی سینەمای سەمیر ئەمیس و ڕەشید و شارع موتەنەبی و چایخانەی پارلەمانی بەغدا کە بەشێکی زۆر لە نووسەر و ئەدیب و سینەماکار و شێوەکار و شانۆکار و هتد لەوێ کۆ دەبوونەوە، ئەحلام وەکو پیاوان سەردانی ئەوێی دەکرد و لە قسەی خەڵک نەدەترسا. بۆیە ساڵی ١٩٩٩ لەگەڵ چیرۆکنووسی بە ڕەگەز عەرەب (شەوقی کەریم) هاوسەرگیری دەکات، بەڵام دیارە شەوقی هەرسی ئەو ژیانە ناکات کە ئەحلام بۆ خۆی هەڵی بژاردووە و تووشی کێشە دەبن، بەڵام بە هۆی کێشەیەکی سیاسییەوە (شەوقی کەریم) دەکەوێتە زیندانەوە. ئەحلام بە ناچار دەچێتە زیندان و لەوێ لە هاوسەرەکەی جودا دەبێتەوە و هیچ یەکێک لەو مافانەشی گەرەک نابێ کە ژنان قەبوڵیانە.

## یاخیگەرێتیی ئەحلام لە ڕۆژنامەگەریدا

ئەوەی کە نووسینی ئەحلامی لە نووسینی ژنانی چالاک لە بواری مەسەلەی ژناندا جودا دەکردەوە، دەستبردنی بوو بۆ شتە تابۆ و حەرامەکان، نموونەش قسەکردنی ڕاشکاوانە و بێپەردانە بوو

بەرامبەر خەتەکردنی ژنان و مەسەلەی سێکس کە ئەو بڕوای نەبوو ژن ئەو کائینەیە دەبێ غەریزەی پیاوان دامرکێنێتەوە. ئەم گوتارە ڕاستەخۆیە کارێکی کردبوو کە هەندێ جار پیاوانی ئایینیی قەڵس دەکرد و دواجاریش ساڵی ٢٠١٠ بوو کە لەسەر بابەتێکی ئەحلام مەلایەکی ئایینی گوتاری نوێژی هەینیی بۆ نووسینێکی ئەو تەرخان کردبوو و کێشەی لەسەر دروست بوو.

سەرەتای ساڵی ٢٠٠١ بوو ئەحلام مەنسوور لە بەغداوە هاتە سلێمانی، لە ڕێگەی برادەرانی (هەفتەنامەی هاوڵاتی)یەوە هاتە ڕۆژنامەکە و وەکو ئەندامی دەستەی نووسەران دەستبەکار بوو، ئەو دیسان بەرمەبنای ئەوە هاوڵاتیی هەڵبژارد، چونکە ئەو هەفتەنامەیە بڕێکی زۆر ئازادیی نووسینی تێدا بوو، هەروەها یاخی بوو لەو سیاسەتە باوەی کە لە کوردستان هەبوو. ئیدی بەو پێیەی یەکێک بوو لە تایبەتمەندییەکانی نووسینی خۆی، مەلەفی ژنانی وەرگرت، زۆر بە جورئەتەوە دەینووسی، تا ئەو ڕادەیەی کە هەندێ جار بە ناچار لە ترسی فشاری ترادیسیۆنی کۆمەڵایەتی و ئایین و هتد، دەستکاریی نووسینەکەیمان دەکرد یان پێمان دەگوت خۆی دەستکاریی بکات. ئەمە جگە لەوەی کە هەر ڕۆژنامە یان گۆڤار یان ڕادیۆ یان تەلەفزیۆنێک چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ساز دەکرد، ئەو بەبێ پەردە قسەی لەسەر چەوساندنەوەی ژنان دەکرد و یەکەم مەسەلەی پەردەی کچێنی بوو کە پێی وابوو هیچ مانایەک نییە وەکو پێوەر وەربگیرێ و بکرێ بە پێوەری ئەخلاقیی تاک.

ئەحلام مەنسوور

ئەمە سەرباری ئەوەی کە ئەحلام بە مەبەستی خزمەتکردن بە ڕەوتی ڕۆژنامەگەریی کوردی، هەر گۆڤار یان ڕۆژنامەیەک داوای نووسینی لێ بکردایە، بە هەمان ستایل بۆی دەنووسین و قسەی خۆی هەبوو، تا ئەو ڕادەیەی کە نووسینی ئەحلام بەوەدا دەناسرێتەوە کە نە فلتەری هەیە و نە سانسۆر. بۆیە لە نێو ئەو بڵاوکراوانەدا جێگەی نەدەبووەوە کە لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە هێڵی سووریان هەبوو. بۆ ئەمەش باجی خۆی دەدا کە بریتی بوو لە دوورخستنەوەی لە چەند ڕۆژنامەیەک، بەڵام بە داخەوە، فریای ئەوە نەکەوت ئەم یادەوەرییانە بنووسێتەوە و من ناچار بکات بیاننووسمەوە. هەزار سڵاو لە گیانی ژنە یاخییەکەی کورد.

# ئەحلام مەنسوور و ڕۆژنامەوانی گۆشەی خەون و خوێن بە نموونە

**لەتیف فاتیح فەرەج**

**سەرەتا**

ئەحلام مەنسوور دەنگێکی جیاواز و ئازا و ئازادی نووسینە. هەر لە سەرەتاوە بە جەربەزەیی و یاخیبوون دەستی پێ کرد. یاخیبوون، دوورکەوتنەوە لە هەر شت، دەستبردن بۆ بڤە و نەخوازراوەکان... بریتی بوون لە کارەکانی ئەو، بە لای عەرەبەکانەوە یەکەمین ڕۆماننووسی مێینەی عێراقییە. نووسەران و ڕەخنەگرانی وەک «حەمید قاسم، عەبدولجەبار عەتابی، سەعدی عەوەز و عەلی بەدایی» لەسەریان نووسیوە و خوێندوویانەتەوە؛ وەک دەڵێن، ئەو جەنگاوەر بوو، خۆیشی لە هەندێ نووسیندا ئاماژە بەو جەنگاوەرییەی خۆی دەدات. ئەو تەنانەت لە ڕامان و وردبوونەوە و جگەرەکێشانیشدا جەنگاوەر بوو، چ لە بەغدا چ لە پاریس، لەو سەردەمەی خۆیدا، واتە لە گەنجیدا، هەندێک سەرکێشیی کردووە کە لە توانا و ئازایەتیی پیاوانیشدا نەبووە، نەک کچێکی گەنجی خانەقینی کە هەر لە حەفتاکانەوە تێکەڵی دنیای جەنجاڵ و پڕ ژاوەژاوی بەغدا بووە، من هەمیشە کە ئەوم بیردەکەوێتەوە، ئەوەم بیردەکەوێتەوە کە چۆن جگەرەکەی دەگرت و چۆن بە مژە قووڵەکانی سییە ساردەکانی و تەنیاییە هەمیشەییەکانی بە دووکەڵەکەی گەرم دەکردەوە. ئەحلام هەمیشە تەنیا بوو، تەنیاییەکی کوشندە، ئەمە لە نووسین و بیر و بۆچوونەکانیشیدا ڕەنگی داوەتەوە. لە گۆشەیەکی خەون

و خوێندا کە ئێمە زیاتر ئەم نووسینەمان بۆ هەڵوەستەکردن لەسەر ئەو وشانە داناوە کە کاتی خۆی لە چەتر بە ناونیشانی خەون و خوێن نووسیونی، بە شێوەیەک باسی تەنیایی خۆی دەکات: «ئەحلام مەنسوور، لە چل ساڵ زیاترە فێمینستی دەکەیت، کەچی ئێستا ڕەنجبێبەر و هەناسەساردیت.» بەو شێوەیە باسی تەنیایی خۆی دەکات. ئێستا کە باسی تەنیاییم کرد، خەیاڵم بۆ ئەوە چوو لە کۆمەڵی ڕۆژهەڵاتی و بە تایبەت کوردیدا هەموو ئەو مێینانەی یاخی بوونە، یان دەستیان بۆ بڤەکان بردووە، خەڵک و کۆمەڵ و ڕۆژگار ستەمی زۆری لێ کردوون. من نامەوێ لێرەدا باسی ئەوە بکەم، ئەحلامیش یەکێکە لەو ستەملێکراوانە، هەرچۆنێکە، ئێمە لێرەدا لەسەر ئەوە ناوەستین.

ئەحلام نووسەرێکی چەپ، نیشتمانپەروەر و شۆڕشگێڕ بوو. ئەمە لە نووسینەکانیدا بە ڕوونی دیارە. ئەو لە دوادوایی تەمەنیشیدا، واتە بەر لەوەی مەرگ سەردانی بکات، هەمیشە هەر بەو شۆڕشگێڕییە مایەوە. ئەو ١٣ گۆشەیەی ئێمە هەڵمان بژاردووە قسەی لەسەر بکەین، ڕاستی قسەی ئێمە دەسەلمێنن. ئەو ١٣ گۆشەیە لە ژمارە ٣٨ تا ٥٠ی هەفتەنامەی چەتردا نووسراون. بەو هیوایەی لە ڕێگەی سەیرکردن و خوێندنەوەی ئەو سیازدە گۆشەیەوە زیاتر بە بیر و بۆچوون و خەونی ئەحلام مەنسوور ئاشنا ببین و بەم کارەش لانی کەم خزمەتێکی بچووکی ئەو ژنە ئازایەمان کردبێت کە لە خانەقینەوە بەیداخی یاخیبوونی هەڵکرد و تا مردیش، هەر بەو جۆرە ژیا و دواجاریش لە ٢٠١٣/١/١٠ گەڕایەوە خانەقین بۆ ئەوەی بە یەکجاری لە گۆڕستانی خدری زیندە پشوو بدات.

## ئەحلام و ئازایەتی

ئەحلام مەنسوور ئافرەتێکی ئازا بوو، ئازا لە نووسیندا، ئازا لە بڕیارداندا، ئازا لە بەردەوامیدان بەو یاخیبوونەی هەیبوو. لەم گۆشانەشدا دیسان ئەو یاخیبوونە ڕەنگی داوەتەوە. لە شوێنێکدا دەڵێ: «شەڕ لەگەڵ دار و بەرد ناکەم، شەڕ لەگەڵ دەسەڵات دەکەم.» کەواتە ئەوە بڕیاری ئەحلام بووە لە ژیاندا. شەڕکردن لەتەک دەسەڵاتدا بۆ

ئەحلام مەنسوور

ئەوەی دنیایەکی باشتر دروست بێت، بۆ ژنێک ئەمە ئەوپەڕی ئازایەتییە. ئەحلام بڕوای وابووە ژن هیچی لە پیاو کەمتر نییە، هەر بۆیە ئەو بڕیارەی داوە. ئەو هەر لەوەدا ئازا نەبووە کە بە گژ دەسەڵاتدا بچێتەوە، لە گۆشەیەکی تردا دەنووسێ: «چل ساڵە باسی ئازادیی ئافرەتان و عیشق و ئازادیی سێکس دەکەم.» ئەمەش دیسان نیشانەیەکی دیاری بەگژداچوونەوەی داب و نەریتە و ئازایەتییە.
ئەحلام لە ژیانی خۆیدا خاتوونێکی ئازا، نووسەرێکی چاونەترس و قەڵەمێکی بوێر بوو. ئەو لە هەموو ئەو کەندولەندانەی هاتنە ڕێی، گەورەتر بوو، بە هیچ زریانێک نەچەمایەوە و هەر بەردەوام بوو، ئەو لە گۆشەیەکدا لە ژێر ناونیشانی «کۆنکۆرد»دا دەنووسێ: «بەردەرکی سەرا واتە گۆڕەپانی ئازادی، بووەتە بنکەی شۆڕشگێڕانی ئەمڕۆی کورد.» هەروەها لە شوێن و گۆشەیەکی دیکەدا دەنووسێت: «ئەمڕۆ پێدەکەنم، چونکە لە گۆڕەپانی ئازادی لە سلێمانی شۆڕشە، لە قەندیل شۆڕشە، لە قامیشلۆ شۆڕشە.» ئەحلام دڵی بەو ئازایەتییەی خەڵک خۆشە، ئەمەش لەبەر ئەوەی خۆی دەیەوێت ئازا و ئازاد بێت، ئەوی ئازا و ئازاد بێت، حەز دەکات هەموو ئەوانی تر ئازا و ئازاد بن. دیارە هەر مرۆڤە ئازا و ئازادەکان دەتوانن خۆیان بن، خۆیان قسە بکەن، خۆیان بڕیار بدەن و لەسەر پێی خۆیان بوەستن. ئەحلام وەک ڕۆژنامەنووسێکی ئازا و ئازاد ئەو گۆشانە دەنووسێت و بۆ خەڵکی ئازا و ئازادی دەنووسێت، ئەو لەتەک ئەوەشدا گلەیی لەوانە دەکات کە نایانەوێ ئازا و ئازاد بن، نایانەوێ خۆیان بن: «چل ساڵە باسی ئازادیی ئافرەتان و عیشق و ئازادیی سێکسی دەکەم، کەسیان نامخوێننەوە.» ئەو ڕووی دەمی لە و ژنانەیە ناتوانن کە ئازایانە باسی خۆیان بکەن، باسی حەز و خەون و خولیای خۆیان بکەن، ئەحلام باسی لادان و لەڕێدەرچوون ناکات، باسی ئەوە دەکات چۆن ئافرەت لە ڕێگەی بێدەنگی و نەبوونی قسەوە نەبێتە قوربانی. من ئەمە وەک ئازایەتییەکی گەورە دەبینم، ئازایەتییەک کە پەیوەستە بەوەوە ئینسان خۆی بتوانێ بڕیاری دروست لەبارەی خۆیەوە بدات. ئازادیی سێکسی لای ئەحلام جەستەبەخشی نییە، یان وەک باوە، جەستەفرۆشی نییە، تا ئەوەی جەستەپارێزییە، ئەوەی کە لام وایە شێخی ئیشراقە بە شێوەیەکی تر باسی دەکات، دۆزینەوەی لەتە سێوەکەی خۆتە. ئەمە تا ڕادەیەکی زۆر جەستەپارێزییە لەپێناوی عیشقێکی ڕاستیدا لە لایەک و لەپێناوی خێزان و هاوسەرگیرییەکی هەمیشەیی و بەختەوەردا لە لایەکی ترەوە.
ئەحلام ژنێکی ئازا بوو، ئازا بوو بەو مانایەی خۆی بڕیاری دا چۆن بژیت، چۆن ژیانێک کە دیارە مەینەتی و نەهامەتیی زۆریشی بەدووی خۆیدا هێنا، هەر لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵی نەریتیدا ئازاکان زۆربەیان سەرگەردان دەبن.

## ئەحلام و نووسین

نووسین لای ئەحلام مەنسوور ئەرک و ئاکار بووە. ئەو بۆیە دەستی داوەتە نووسین، بۆ ئەوەی لە گۆڕینی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و هەروەها گەشەی فێمینستی لە کۆمەڵی کوردیدا بەشداری بکات. ئەو دەڵێ «خۆم لە ڕۆژنامەنووسانی جیهانی بە کەمتر نازانم.» بەڵام قەدەری ئەو ئەوەیە کە کوردە. ئەو چل ساڵ خەریکی نووسین بووە بۆ ئەوەی دۆخی ئافرەتی کورد باشتر بکات، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی نووسینەوە باسی خۆی، ژنانی کورد، ئازارەکانی کوردبوون و مەینەتییەکانی کورد بگێڕێتەوە. نووسین بۆ ئەحلام ئەرک و ئاکار و بەرپرسیارێتی بووە، هەموو ئەو نووسەرە عەرەبانەی لەسەریان نووسیوە، ئاماژە بە هەمان ئەو بۆچوونەی ئێمە ئەدەن.
هەر نووسینیش بووە هۆی نەهامەتیی گەورە بۆ ئەحلام، ناوبانگ و ناوناتۆرە. واتە نووسین هەم ناوبانگێکی بەو بەخشی، هەم ناوناتۆرەی زۆریشی بۆ دروست کرد.
ئەحلام بۆ ناوبانگ نەینووسیوە، ئەو خۆی لەو بارەیەوە لە هەمان ئەو گۆشانەدا، گۆشەی کۆنکۆرد، دەڵێ «چەندین ساڵە بۆ گەنجی کورد دەنووسم، مەبەستیشم نەبوو ناسراو بم، یان بازرگانی بە نووسینەکانمەوە بکەم.» ئەو بۆ ناسراوی و ناوبانگ و خۆی وتەنی، بۆ ئەوە نانووسێ کە بازرگانی بە نووسینەوە بکات. ئەو بۆ گەنجی کورد، بۆ ڕابوون و ڕاپەڕینی گەنجی کورد دەنووسێ. نووسینی ئەو بۆ هەستان و هۆشیارییە، بۆ ئەوەیە کە ئینسانەکان

هەڵوەستە بکەن و بیر لە خۆیان بکەنەوە، بیر لەو بارودۆخە بکەنەوە کە تێیدان، بیر لەوە بکەنەوە چۆن بەرەو پێشەوە بڕۆن. هەڵبەت لەگەڵ ئەوانەشدا ئەو بۆ ئەوە دەنووسێ کە حکومەت و دەسەڵاتداران ستەمکار و درۆزن نەبن، لەگەڵ خەڵک و سوێندەکانی خۆیاندا ڕاستگۆ بن و متمانە لە دەست نەدەن. ئەوەتا لە شوێنێکدا ڕوو دەکاتە سەرۆکی حکومەت: «ئەی سەرۆکی حکومەت، بۆچی ڕاستگۆیی خۆی لە دەست دا، ئەمڕۆ کەس بڕوای پێ ناکات، جێی متمانە نییە.» بەو زمانە ڕەخنە لە حکومەت دەگرێت، گەرچی حکومەت و سەرۆکەکەی لە دوای ئەو نووسینانەشەوە مەینەتیی زۆرتر و زیاتریان بۆ میللەت هێنا. بۆ ئەحلام نووسین شۆڕشە. ئێمە لە شوێنی دیکەدا لەسەر شۆڕش لای ئەحلام هەڵوەستە دەکەین، بەڵام کۆی ئەم نووسینانەی ئەم گۆشانە دەری دەخەن کە ئەحلام مەنسوور وەک شۆڕش لە نووسین دەڕوانێ و لە ناخەوە دەنووسێ، ئەوەش بەسە بۆ ئەوەی نووسەرێکی بوێر و ئازا لە نووسەری دەربار جیا بکەینەوە.

ئەحلام ڕقی لە ڕۆژنامەوان و نووسەرانی دەربار بووە: «ڕۆژنامەنووسی وا هەیە هەمیشە زوڕنا بۆ دەسەڵات لێ دەدات، هەمیشە تەپڵ بۆ دەسەڵات لێ دەدات، هەمیشە جرت بۆ دەسەڵات دەکێشێت.» ئەو خەون بە ڕۆژنامەنووسی ئەرێنی و ئازاوە دەبینێت، هەر بۆیە لە هەی وەی شێرەکەیدا بۆ ڕێژوان حاجی عەلی، باسی سۆرانی مامە حەمە و سەردەشت عوسمان دەکات.

### ئەحلام و خەمی ژیان

لە کۆی ئەم سێزدە گۆشەیەدا دەردەکەوێت کە ئەحلام مەنسوور چ پەیوەستی و پەیوەندییەکی قووڵی بە ژیانەوە هەبووە، ئەو پەیوەستی و پەیوەندییەش هەر لەپێناوی ئازادیی ئەوانی دیکەدا بووە، نەک لەبەر خۆی و بۆ دەستگرتن بە ژیانەوە: «باشە کە جارێ نەمردووم، سبەی دووسبەی قامیشلۆ بە ئازادی دەبینم.» بۆ ئەوە دەژێت و نایەوێ جارێ بمرێ تا قامیشلۆ بە ئازادی ببینێ، بۆ ئەوەی بۆنی حەلەب بکات، ئەو حەلەبەی نەیارەکان هەموو جوانییەکەیان شێواند، ئەو حەلەبە نازدارەی شوێنەوار و جوانییەکەی سەرنجی دنیای بە لای خۆیدا ڕاکێشابوو. ئەحلام دەیەوێ بژێ بۆ ئەوەی سەرکەوتنی شۆڕشگێڕەکان ببینێ، بۆ شۆڕشەکەی تونس دەنووسێت: «ژیان هەر بۆ شۆڕشگێڕانە.» پەیوەندیی نێوان ئەحلام و ژیان ئەم بابەتەیە و هیچی تر.

ئەو پەیوەندییە زیاتر خەمی ژیانی ئەوانی تر بووە تا خۆی، ئەو خەمی ژیان و ئازادیی ئەوانی تری بووە، بۆ ئەوەی ئایندە لە ئێستا باشتر بێت، بۆ ئەوەی مرۆڤ بە ئازادی و دوور لە ستەم و چەوسانەوە بژێت، بۆ ئەوەی میللەتەکەی هەمیشە لە نەهامەتی و ستەمدا نەبینێ، خۆیشی دەڵێت: «تۆ بڵێی تاوانی ئەم میللەتە نازدارە چی بێت وا لەو نەهامەتییەدایە.» ئەو ژیانی بۆ ئەوە بوو کۆتایی ئەم نەهامەتی و ستەمە ببینێ، ئەو بەو تەمەنەشەوە، بەو هەموو ئازار و برینەی ڕۆژگاریشەوە خۆی دەڵێت: «شەو و ڕۆژ بە دیار کەناڵی ئەلعەرەبیەوە دانیشتووم.» خەمی ئەحلام ئەمەیە، خەمی بەدیهاتنی خەونەکانی خەڵک، خەمی گەیشتن بە ئامانجی خەڵک، ئەو خەڵکەی هەمیشە قوربانیی داوە بۆ ئەوەی بگاتە ئاسوودەیی.

ئەو ویستی ژیانی هەبوو بۆ ئەوەی مەرگی ستەمکاری و کۆتایی نادادی و گەندەڵی ببینێت، هەر خۆیشی دەیپرسی: «تۆ بڵێی هەتاهەتایە هەر تلیاکی گەندەڵی بکێشین.» ویستی ژیان بۆ ئەوەی گەندەڵی و نادادی و ستەم نەمێنێ، پیرۆزترین ویستی ئینسانی شۆڕگێڕ و ئازادە.

ئەحلام وەک هەر ئازادیخوازێکی تری سەر ئەم گۆی زەوییە مرد و خەونەکانی نەهاتنە دی. تۆ بڵێی ڕۆژێک بێت خەونی مرۆڤایەتی بێتە دی و ستەم و نادادی بە تەواوەتی کۆتاییان هاتبێت؟

خەونبینین بە شۆڕشەوە
لەو سێزدە گۆشەیەی چەتردا زیاتر لە ٧ گۆشەیان قسەکردنن لە شۆڕش و ڕاپەڕین. لە گۆشەکانی دیکەشدا کەم و زۆر گەڕاوەتەوە سەر هەمان بابەتی شۆڕش، تەنها گۆشەکانی «١، ٩، ١٠» کەمتر بە لای ئەو بابەتەدا چوون، ئەویش گۆشەکانی نۆ و دە باسی ئازادیی ژن و گۆشەی یەکەمیش لەسەر خۆپەروەردەکردن و خوێندنەوە و هۆشیارییە، بە جۆرێک، لە گۆشەی یەکەمدا لەبارەی خوێندنەوەوە دەنووسێت: «ئەگەر خوێندنەوە تێکەڵی خوێن نەبێت و لە دەمارەکانی لەشدا نەسووڕێتەوە، هەروەها دەمارە باریکەکانی مێشکمان نەبێت و لە هەڵوێستدا بەرجەستەی نەکەین، خوێندنەوەی پێ ناوترێ.» هەروەها باسی هەوڵەکانی خۆی لەبارەی خوێندنەوەوە دەکات و باسی خوێندنەوەی کۆی کارەکانی دۆستۆیڤسکی دەکات لە ڕابوردوودا، لێ کۆی گۆشەکانی دیکە گۆشەی ئازادی و شۆڕشن. ئەحلام بەردەوام خەونی بە شۆڕش و سەرکەوتنی شۆڕشەکانەوە بینیوە. ئەو چاودێرێکی بەردەوامی شۆڕش بووە کە ئاخۆ دەگاتە ئەنجام یان نا، شۆڕشی تونس، هیی میسر، هیی کوردستان، هیی شوێنەکانی دیکە؛ هەر خۆی دەڵێت: «تەنها بانگەوازێک لەسەر ئینتەرنێت ئەو هەموو گەنجەی کۆ کردەوە کە یەک خەونیان هەبوو، ئەویش ڕاپەڕین.» ئەمە باسی شۆڕشی میسرە، بۆ لای خۆیشمان نووسیویەتی: «خۆزگە شۆڕش بۆن بوایە، ئاو بوایە، ئەستێرە بوایە، وشە بوایە.» هەروەها بۆ جگەرخوێن دەنووسێ: «بەڵام ئەمڕۆ پێدەکەنم، چونکە لە گۆڕەپانی ئازادی لە سلێمانی شۆڕشە، لە قەندیل شۆڕشە، لە قامیشلۆ شۆڕشە.» لە شوێنێکی دیکەی هەمان وتاردا دەنووسێت: «ئەمڕۆ ڕۆژی منە، ڕۆژی هەموو کوردێکی ڕەسەن و ئازادە، وەک ژنانی کوردستان هەلهەلە دەکێشم، بە قوربانی شەهیدە پیرۆزەکان دەبم.»
ئەحلام بۆ شۆڕش دەنووسێ، تەنانەت داوای لێبوردن دەکات کە بە هۆی تەندروستییەوە ناتوانێ بچێتە بەردەرکی سەرا و بەشداریی شۆڕش بکات، بۆ ئەحلام، ئەوەی لە ١٧ی شوباتدا لە سلێمانی گوزەرا و زیاتر لە ٦٠ ڕۆژی خایاند، شۆڕش بوو، کەموکوڕی و کێماسیی هەبووبێ یان نا، باش ڕێک نەخرابووبێ یان نا، هەموو ئەمانە بۆ ئەو جێی هەڵوەستە نین، هێندەی ئەوەی ئەوە شۆڕشێکە بۆ ئازادی و کەرامەت.

# ئەحلام مەنسوور

کاتێ کە شۆڕش و خۆپیشاندانەکانیش خەڵتانی خوێن دەکرێن، دادە ئەحلام ئازار دەچێژێ و هەی وەی شێرە دەکات، لایلایە بۆ خوێن و برین و مەرگ دەکات، لایلایە بۆ برسێتی و مەینەتی و فرمێسکی قەیرانەکان دەکات، باسی ئازار و برینەکانی خۆی دەکات و هاوار دەکات: «بریندارم، خوێن لە برژانگ و لە نینۆکەکانم دەتکێ، هەتاوەکو نووکی مووەکانی سەرم، سەرتاپا خوێناویم.» بەم جۆرە ئازارەکانی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە.

ئەحلام بەردەوام خەونی بە شۆڕش و گۆڕانکارییەوە بینیوە و حەزی کردووە خۆی بکاتە قوربانی شۆڕشگێڕان، چونکە: «ژیان هەمیشە بۆ شۆڕشگێڕانە.» ئەوە کەسە شۆڕشگێڕەکانن مانەوە و جوانی بە ژیان دەبەخشن. بەم جۆرە، خەونی گەورەی ئەحلام شۆڕش بووە، لە کۆی نووسینەکانی ئەم گۆشانەدا ئەگەر بە وشەیەکیش بووبێت، گەڕاوەتەوە بۆ لای یاخیبوون و شۆڕش و بەگژاچوونەوەی ستەم و نادادی.

ئەحلام هەر لە گەنجییەوە خۆیشی ڕۆحێکی یاخی و شۆڕشگێڕانەی هەبووە، ئەمەش تووشی مەینەتی و ڕەنجەڕۆیی زۆری کردووە، ئەوە تەنانەت لە ڕەنگوڕوو و هەڵسوکەوتیشیدا ڕەنگی دابووەوە. ئەمە بەبێ ئەوەی بکەوێت یان خۆی بە دەستەوە بدات. ئەو تا مرد، وەک شۆڕشگێڕ و یاخییەک ژیا و خۆی بە دەستەوە نەدا، با گلەیی و گازندەی زۆریشی هەبووبێت، لێ بیروباوەڕی بە شۆڕش هەرگیز لەق نەبوو، بۆیە لە بەر خۆیەوە شیعرە بە ناوبانگەکەی ئەبولقاسم ئەلشابیی دەوتەوە.

### گۆشەی خەون و خوێن

ئێستا هەقی خۆیەتی بپرسین، بۆچی ئەحلام مەنسوور وەک ڕۆژنامەوان و ستوونووسێک، وەک نووسەرێک، وەک ڕەخنەگرێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فێمینیستی، ئەم گۆشەیەی ناو ناوە خەون و خوێن؟ خەون وەک هەنگاونان بەرەو ئامانجێکی پیرۆز، بەرەو ئازادی و خودخاوەنی. هەڵبەت ئامانجی پیرۆزی ئازادی و خودخاوەنی ڕێگەیەکی فەرشی گوڵڕێژ نییە، بە دڕکوداڵ تەنراوە، بۆیە هەمیشە خوێنی دەوێت، قوربانیی دەوێت. ئێستا کە سەیری گۆشەکان دەکەین و بە وردی دەیانخوێنینەوە، لە مەبەستی دادە ئەحلام تێدەگەین، تێدەگەین بۆچی گۆشەکەی ناو ناوە خەون و خوێن، ئەو دەیزانی بۆ گەیشتن بە خەونەکە، بۆ هاتنەدیی خەونەکە، خوێنی پیرۆزی دەیان و سەدانی لاوی خێرلەخۆنەدیوی وەک ڕێژوان عەلی دەڕژێت، خۆزگە وا نەبوایە و وەک خۆی دەڵێت، شۆڕش خوێنی نەویستایە، گەیشتن بە ئامانج و ئاواتەکان گرێ نەدرایە بە قوربانیدان و خوێنڕژانەوە، بەڵام خۆ خۆزگە خەونەکان ناهێنێتە دی؛ تا محەمەد بووعەزیزی نەبێتە قوربانی، تووڕەیی کڵپە ناسێنێ، ئەمە بۆ هەموو شوێنێک کە ستەمکاری و نادادی هەیە، هەر وایە. بۆیە هەڵبژاردنی ئەو ناونیشانە بۆ گۆشەکەی گرێدراوی بیروباوەڕی یاخیگەرییانەی خۆیەتی، لە نێو ئەو ناوانانەدا ڕێک ئەحلام مەنسووری خاوەن خەون و هیوادار بە ئایندەی باشتر دەبینێ، کە دەیەوێت لە ڕێگەی شۆڕشەوە خەون بکاتە هەقیقەت، هیچ خەونێکی پیرۆزی سیاسی، کۆمەڵایەتی و جڤاکی نابێتە هەقیقەت ئەگەر قوربانیی بۆ نەدرێت.

### ناونیشانی گۆشەکان و هەڵوەستەیەک

ئەو گۆشانەی ئەحلام مەنسوور لە ژمارە ٣٨ تا ژمارە پەنجای چەتر لە ساڵی ٢٠١١دا نووسیونی، لەژێر ئەم ناوانەدان:

یەکەم: هەموو شتێک هەر سفرە. باسی خوێندنەوە و بایەخی خوێندنەوە و چالاکیی نەوەی پێشوو لەو بارەیەوە دەکات. دەشنووسێ: «من خۆم بە ڕۆشنبیر دەزانم، کەواتە من تووتییەکی جوانم.»

دووەم: شکستی نەهێنان. باسی بێباکیی دەسەڵاتی خۆماڵی بەرانبەر میللەت دەکات و دەنووسێ: « شەڕ لەگەڵ دار و بەرد ناکەم، شەڕ لەگەڵ دەسەڵات دەکەم.»

سێیەم: ڕاپەڕینی گەنجان. باسی ڕاپەڕینی گەنجانی تونس و بڵێسەی شۆڕشەکەی محەمەد بووعەزیزی دەکات کە لە شارۆچکەی «سیدی ئەبو زێد»ەوە هەموو تونسی گرتەوە، هەروەها باسی شیعرە بەناوبانگەکەی ئەبو ئەلقاسم ئەلشابی دەکات: «ئەگەر گەلێ ڕۆژێ ویستی ژیانی بێ.» دەشڵێت: «هیوادارم دەسەڵاتی کوردی بە خۆیدا بچێتەوە.»
چوارەم: شۆڕشی یاسەمین. باسی شۆڕش دەکات و هەڵوەستە لەسەر قۆناغەکە دەکات و دەنووسێ: «خۆزگە شۆڕش بۆن بوایە، ئاو بوایە، ئەستێرە بوایە، وشە بوایە.» بەڵام کوشتنوبڕین و خوێنڕشتن نەبوایە.
پێنجەم: شۆڕشی نیل. سۆراخی شۆڕشی میسر دەکات و دیسانەوە ڕەخنەی خۆی دەگرێت، هەروەها دەنووسێت: «بیستوپێنج هەزار گەنج کە پەیوەندییان بە سیاسەت و هیچ حزبێکەوە نەبوو، لە ٢٠١١/١/٢٥ لە میسر ڕاپەڕین، تەنها بانگەوازێک بوو لەسەر ئینتەرنێت کە ئەم هەموو گەنجەی کۆ کردەوە، یەک خەونیان هەبوو، ئەویش ڕاپەڕین.»
شەشەم: شۆڕشی گەنجان بە ئەمەریکای وت نا. خۆی دەڵێت کاژێر چواری بەرەبەیان ئەم ستوونە دەنووسم، پێشتریش ئاماژەی بەوە کردووە کە بە دیار کەناڵی ئەلعەرەبییەوە دادەنیشێت. هەروەها دەنووسێت: «حوسنی موبارەک ڕای نەکرد، هەڵنەهات، گوێم لێ بوو وتی: (لە میسر دەمرم، چونکە من میسریم و میسرم خۆش دەوێت.) هەر لەوێشدا دەڵێ «خۆم لە ڕۆژنامەنووسانی جیهان بە کەمتر نازانم.»
حەوتەم: ئێتیکی ڕۆژنامەوانیی ئەمڕۆ. لەو گۆشەیەدا دەنووسێت: «ڕۆژنامەنووسی وا هەیە هەمیشە زوڕنا بۆ دەسەڵات لێ دەدات.» هەروەها باسی ڕابوردووش دەکات: «خۆی لە خۆیدا ئەدیبە گەورەکانی میللەت بوون بە ڕۆژنامەوان.» باسی مامۆستا عەلادینی سەجادی و برایم ئەحمەد دەکات، هەروەها باسی بەدبەختیی ڕۆژنامەنووسیی ئەمڕۆی کوردی دەکات.
هەشتەم: شەهید ڕێژوان عەلی جوانەمەرگ شێرە. لەوێدا شینگێڕی و هەی وەی شێرە بۆ ڕێژوان و شەهیدانی حەڤدەی شوبات و سۆرانی مامەحەمە و سەردەشت عوسمان دەگێڕێ و دەڵێت:

هەیوە شێرە – هەیوە شێرە
پێنووسە پیرەکەم شێرە
هەیوە شێرە
شەهیدە جوانەمەرگەکان شێرە
هەیوە شێرە
شەهید ڕێژوان عەلیی جوانەمەرگ شێرە
سۆرانی مامەحەمە شێرە
سەردەشت عوسمان شێرە
زیندانە سیاسییەکان شێرە
گیڤارا شێرە – مارکس شێرە – ئارام شێرە

لێرەدا کەوتووەتە هەڵەیەکەوە گوایە هەی وەی شێرە جۆرێک شینگێڕیی ژنانی خانەقین و هەولێرە بۆ ئازیزانیان، لە کاتێکدا ئەو جۆرە شینگێڕییە لە ناوچەی شوان و جەباری و چەمچەماڵ و سنووری کەرکوکیش هەیە و من خۆم بە منداڵی دەیان جارم گوێ لێی بووە. کەسێک ڕستە کورت و شیعرییەکان دەڵێت و ئەوانی دیکە هەموو دەڵێن هەی وەی شێرە، ئێستا یان ئەوەتا من زۆر کەم دەچمە نزیکی پرسەی ئافرەتان، یان زۆر کەم بووەتەوە. من لە نووسینێکدا بە نێوی شینگێڕی لە ئەدەبی کوردیدا، یان شیوەن لە ئەدەبی کوردیدا، کە ماوەیەکە خەریکیم و نموونەی شیعرەکانی گۆران، ئەوەی بۆ هیوای کوڕی و بۆ بێکەس و هتد نووسیویەتی، مەولەوی، هەروەها هەژاری شاعیریش کە هەم بۆ هێمن و هەم بۆ مەلا مستەفای بارزانی و هتد شینی گێڕاوە، بە نموونە هێناوەتەوە، لەوێدا باسی شینگێڕیی ژنان و هەی وەی شێرەش دەکەم.
نۆیەم: شۆڕش – لەچک = میللەت. باسی ئازادیی پۆشین و لەچک و ئازادیی سفوری و ئافرەت دەکات. دەڵێ: «لە ساڵی ١٩٦٩دا لە خانەقین مۆدێلی پانتۆڵی چارلستن ڕووی کردە ئێمە، تا ڕادەیەک کراسەکانمان درێژ بوو.» هەروەها دەنووسێ: «لە چل ساڵ زیاترە فێمینستی دەکەیت، کەچی ئێستا ڕەنجبێبەر و هەناسەساردیت.»
دەیەم: ئافرەتان لە چ ڕۆژێکدان. لەو وتارەدا ڕەخنەی زۆر ورد و ئازایانە دەگرێت: «ئێستا مۆدێل مۆدێلی مەمکگەورەکردنە، قنگبەرزکردنە، برۆی تاتۆ، نەشتەرگەریکردن بۆ جوانیی ڕوخسار، ڕوومەتخڕکردن، لوتبچووککردن، چرچولۆچیی

دەموچاو و قژ لە ئوتوودان.» ئەو ڕەخنانە لە ئافرەتان دەگرێت و باسی ئازادیی ئافرەت دەکات.

یازدە: کۆنکۆرد. باسی پاریس و گۆڕەپانی کۆنکۆرد و بەردەرکی سەرا و گۆڕەپانی ئازادیی سلێمانی دەکات. دەنووسێ: «گۆڕەپانی ئازادی بووەتە بنکەی ئەمڕۆی شۆڕشگێڕانی کورد.» هەروەها دەنووسێ: «شەو و ڕۆژ بەرانبەر کەناڵی ئەلعەرەبیە دانیشتووم، واتە ئاگام لە شۆڕشی تونس و میسر و یەمەن و بەحرەین و لیبیا هەیە، وەک کۆنەشیوعییەک ئاگام لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر و چین و کوبا و ڤێتنام و کۆریا و پێش ئەمانەش ئاگام لە شۆڕشەکانی خۆمان هەیە.» گلەیی ئەوەش دەکات کە: «لە هەولێر و دهۆک کەس ناوێرێ بڵێ لەل.» ڕەخنەی توندیش لە بێهەڵوێستیی سەرۆکی حکومەت دەگرێ.

دوازدە: قەدەر. دەنووسێت: «باشە کە جارێ نەمردووم، سبەی دووسبەی قامیشلۆ بە ئازادی دەبینم و بۆنی حەلەب دەکەم و ئەو کچە جوانانە ماچ دەکەم.» هەروەها باسی چارەنووسی خۆی دەکات.

سێزدە: حکومەتە ئیفلیجەکەمان مۆرانە خواردی. لەوێدا ڕەخنە لە حکومەت دەگرێت و هەروەها دەڵێت: «چەند عارەبانە لای مزگەوتی گەورە بوەستن، ئەوەندە بلۆکی دۆلار دەچێتە گیرفانی فیرعەونەکانەوە.»

لە کۆی ئەم سێزدە گۆشەیەدا زانیاری، گێڕانەوە و یاداشت، ڕەخنە و هەروەها دیرۆک و زۆر بابەتی تر قسەیان لێوە کراوە، باسی پاریس و بینینی جگەرخوێنی شاعیر دەکات، باسی گریانی ئەو ڕۆژە و پێکەنین و دڵخۆشبوونی ئێستای، چونکە: «لە گۆڕەپانی ئازادی لە سلێمانی شۆڕشە، لە قەندیل شۆڕشە، لە قامیشلۆ شۆڕشە.»

لە کۆتایی ئەم کورتەنووسینەدا کە زیاتر هەڵسەنگاندن و خوێندنەوەی ئەو سێزدە گۆشەیەی ئەحلام مەنسوورە، دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە خاتوو ئەحلام توانای گۆشە و ستوونووسینی زۆر باشی هەبووە و توانیویەتی لە ڕێگەی ئەم نووسینانەوە هەم دید و بۆچوونی خۆی دەربڕێ، هەم هەواڵێک یان بابەتێکی گرنگ و جێباسمان بۆ باس بکات. وەک وتیشم، لە نێو نووسینەکاندا دیرۆک و ڕووداو و بابەتی سەرنجڕاکێشی بۆ گێڕاوینەتەوە و ویستوویەتی لەبارەی دوێنێ و ڕابوردووەوە زانیاریمان بداتێ و هەندێ بابەتمان بیر بخاتەوە. ئەو لە ژیانی خۆیدا بە قوربانیدان بە زۆر حەز و خەونی ژنانە زۆر کۆتوبەندی شکاند، ئەوەش بەسە بۆ ئەوەی وەک نووسەر و ڕۆژنامەوانێک بە زیندوێتی لە یادەوەریماندا بمێنێتەوە.

تێبینییەکی کورت: ئەم بابەتە بە تەنێ هەڵوەستەکردنە لەسەر ١٣ گۆشەی خوێن و خەون، نەک زیاتر.

# بۆ ئەو کەسەی هەرگیز درۆی لەگەڵ خۆی نەکرد

**ئاسۆس هەردی**

کەم کەسم دیوە ئەوەندەی ئەحلام مەنسوور لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆ بووبێت. ئێمە هەموومان لە ناخەوە دوو کەرت و دوو پارچەین! دوو کەسین لە یەک کەسدا! لە ڕووی مەنتیق و تیۆرییەوە باوەڕمان بە زۆر شت هەیە و زۆر بەهای مرۆڤانە و سەردەمییانەمان پێ قبوڵە و داکۆکیی لێ دەکەین. بەڵام کە دێتە سەر ژیانی واقیعی و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەمان لە کۆمەڵگەدا، لە زۆر کێشەدا، بەتایبەت لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، جورئەت ناکەین لەو چوارچێوانە دەربچین کە داب و نەریتە کۆن و دواکەوتووەکان بۆیان دیاری کردووین.

بۆیە هەموومان ڕۆژانە و لە زۆر هەڵوێست و ڕووداودا درۆ لەگەڵ خۆمان دەکەین. ڕەفتارێک دەنوێنین کە هیچ بڕوامان پێی نییە و بە ڕاستی نازانین، گلەییش لە خەڵکی تر دەکەین کاتێک هەمان ڕەفتار دەنوێنن.
ڕاستگۆیی ئەحلام مەنسوور لەوەدا بوو هەرگیز وەک ئێمە درۆی لەگەڵ قەناعەتەکانی خۆی نەکرد. چۆن لە ڕووی تیۆری و مەنتیقییەوە لە داب و نەریت و کولتووری دواکەوتوو یاخی بووبوو، ئاواش لە ژیانی ڕۆژانەدا بەوپەڕی قەناعەت و جورئەتەوە، هەمیشە وەک کەسێکی یاخی ژیا. هەرچەندە ئەم ڕاستگۆییە زۆر گران لەسەری کەوت، کێشە و ململانێ و هاوڕێ و هاوڕای درۆزنی زۆر تووش کرد، بەڵام ئەو هەرگیز کۆڵی نەدا و ئامادە نەبوو دەستیلن لێ هەڵبگرێ و درۆ لەگەڵ خۆیدا بکات.
من ئەحلام مەنسوورم لە ڕێگەی چیرۆک و هەندێ لە دیدار و گفتوگۆکانییەوە دەناسی. بۆ من ئەو ناوێکی گەورە و یاخییەکی گەورە بوو. بۆیە خۆشبەختییەکی گەورە بوو کاتێک لەناکاو ڕۆژێک لە ڕۆژانی سەرەتای ساڵی (٢٠٠١) کتوپڕی خۆی کرد بە ژووره بچکۆلەکەی ڕۆژنامەی (هاوڵاتی)دا و بەبێ هیچ پێشەکی و سەرەتایەک وتی: «من بڕیارم داوە بێمەوە لە کوردستان بژیم. بۆ لای هیچ حیزب و ناوەندێک ناچم، دێم لە هاوڵاتی کار دەکەم.» ئەوە بۆ من و هاوکارەکانیشم، شانازییەکی گەورە بوو. لێرەشەوە ئەو دەرفەتەمان بۆ ڕەخسا لە نزیکەوە بیناسین. ڕەنگە یەکێک لە خۆشبەختییەکانم ئەوە بووبێت کە ئەو دەرفەتەم دەستکەوت و ئەو ژنە یاخی و ڕاستگۆ و ئازایەم لە نزیکەوە ناسی.
ڕۆحی شاد و یادی هەمیشە زیندوو بێت.

# ئەحلام مەنسوور لە مەیدانی شارەوە بۆ مەیدانی ئەدەب و سیاسەت

**ئیبراهیم باجەڵان**

زۆر زەحمەتە بە تەواوەتی لە بلیمەتی و داهێنانی نووسەران و هونەرمەندان تێبگەین بەبێ گەڕانەوە بۆ چۆنێتیی ژیان و ژینگەکەیان: دەنا نووسەران و هونەرمەندان، وەکو منداڵێکی ئاسایی لەدایک دەبن و نەشونما دەکەن. سەبارەت بە ئەحلام مەنسوور، لە خێزانێکی ڕەسەنی کورد، لە گەڕەکێکی دێرینی (خانەقین)ی سەنگەری پێشەوەی کوردستان چاوی بە جیهان هەڵهێنا، بەڵام بە هۆی بلیمەتی و زیرەکیی خۆی، لەژێر کاریگەریی ژینگەکەیدا بووە. ئەو کچە نووسەرە بەناوبانگ و بەناودەنگە، بە توانا و لێهاتوویی کەسایەتیی تایبەتی خۆی گەیشتە ئەو ئاستە بەرزە لە داهێنان و ئەفراندندا. هەر وەک مامۆستای چیرۆکنووس (غەفوور ساڵح) دەڵێت: «ئەحلام یەکەم کەس بوو، وەکو ژنەچیرۆکنووسێکی کورد باسی (فێمینیزم)ی کردووە، لە ئاستی عێراق و کوردستانیشدا کچێکی ڕووناکبیری ئەو مەیدانە بوو. سەرەڕای ئەوەی چیرۆکنووس و ڕۆماننووس بوو، ڕۆژنامەوانێکی بەئەزموون بوو و لە زۆربەی ڕۆژنامە کوردی و عەرەبییەکاندا کاری

کردووە و جێپەنجەی دیارە.»
وەکو ئاشکرایە ئەحلام ساڵی (١٩٥١) لە گەڕەکی (عەبدوڵڵا بەگ)، لە کۆڵانێکی مەیدانی (خانەقین) کە نزیکی (چایلغ)ە، لە بنەماڵەیەکی کرێکار چاوی هەڵهێنا. (مەنسوور عەلی ئەکبەر)، باوکی ئەحلام لە کۆمپانیای نەوت کارمەند بوو، دایکی ئەحلام (ڕەسمیە حاجی حەمە ساڵەح کوتاڵفرۆش) کە لە هۆزی (باجەلان)ە. لە ئەو ڕۆژانەدا کە ئەحلام لەدایک بوو، خاوەن دوکانی کوتاڵفرۆشی بوو. بەڵام (حاجی حەمە ساڵەح) لە سەرەتای گەنجێتیدا لە کۆمپانیا کاری دەکرد. ماڵی باوکی ئەحلام لە گەڕەکی ماڵی خەسووی (حاجی حەمە ساڵەح) لە یەک خانوودا بوون، وەکو زۆربەی دانیشتوانی ئەو سەردەمەی گەڕەکە میللییەکان خانووەکەیان لە تەنیشت مزگەوتی (مەجید بەگ) بوو کە دەکەوێتە بەرانبەر (خان شاناز)، ناسراو بە (خان ناوخاس). ئەو کۆڵانە کە ئەحلام تێیدا لەدایک بوو و پەروەردە بوو، نزیکی مەیدانی ئاژەڵفرۆشتن بوو. لە هەمان کاتدا نزیکی مەیدانی شار بوو کە جاران دڵ و ناوجەرگەی شار بوو، چونکە چەندین خان و کاروانسەرا و دوکان و چایخانەی لێ بوو و جێگەی خاوەن پیشەکان بوو، وەکو ناڵبەندەکان، ئاسنگەرەکان، کوتاڵدوورەکان و بازاڕی دانەوێڵە، گەنمفرۆش و جۆفرۆشەکانیش زۆربەیان لەو شوێنەدا بوون، لەگەڵ مەیدانی دارفرۆشەکان. بۆیە ئەو ناوچەیە لە بەرەبەیانەوە وەکو شارەمێرووڵە جمەی دەهات لە خەڵکی ئاواییەکانی دەوروبەری شار و جووتیار و کاسبکارانی (ورەتوو) و هۆزێنی (شێخان) و هتد. دانیشتوانی گەڕەکەیشی بە گشتی، مەیدانی (کۆدەرە)یش بە تایبەت، خەڵکانێکی کرێکار و کاسبکار و ماسیگر، لە هەمان کاتدا چەند مامۆستا و فەرمانبەرێک لەگەڵ باخەوانەکانی شاردا، زۆربەیان دانیشتوانی ئەم گەڕەکە بوون، چەند خاوەن موڵکێکیش وەکو بنەماڵەی (دای زادەکان) و ئاغاکانی (باجەلان) دیوەخان و ماڵیان لەو گەڕەکەدا بوو، دانیشتوانی ئەم گەڕەکە فرەیان کورد بوون، بە کوردی قسەیان دەکرد، بەتایبەت بە شێوەزاری (کەلهووڕی)، بە تورکمانیش قسە دەکرا. چونکە دانیشتوانانی گەڕەکەکە پێک هاتبوون لە هۆزەکانی (قەرە لووسی) و (باجەلان) و (سوورەمەیری) و (کاکەیی) و چەند ماڵێکی عەرەبیش لە (مەیدان) دەژیان. ژنانی گەڕەک، وەکو هەموو گەڕەکە میللییەکان بەبێ پێچوپەنا و ڕاستەوخۆ و بە ڕاشکاوی باسی هەموو شتێکیان دەکرد و هەموو وشەیەکیان بەکار دەهێنا، تەنها بە وتنی (بیلامانێ).

لە ئەو ڕۆژگارەدا ڕادیۆ لە ماڵەکاندا زۆر کەم بوو، بۆیە شەوانە چەند خێزانێک لە ماڵێکدا کۆ دەبوونەوە (مەلەک ئەحمەد، کوڕە کەچەڵ، دیۆ سفید)یان دەگێڕایەوە، ئەحلامیش وەکو منداڵێکی هەستیار بە دڵ و گیانەوە گوێبیستی ئەو حیکایەتانە دەبوو کە لە (خانەقین) مەتەڵیان پێ دەگوت.

### پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەمە و هاوکاریکردنی یەکتر

پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە نێوان دانیشتوانی گەڕەکە دێرینەکان زۆر توندوتۆڵ و پتەو بووە، وەکو خانووەکانی جارانی شارەکە لە توانای مرۆڤدا بوو لە ئەمپەڕی گەڕەکەوە تا ئەوپەڕی گەڕەک بە سەربانەکاندا بڕوات. گیانی هەرەوەزی و یەکسانی باو بوو. لە خۆشی و ناخۆشیدا، لە شین و شادیدا بەشداریی یەکتریان دەکرد و لە تەنگانەدا یارمەتیی یەکتریان دەدا و دەستی یارمەتییان بۆ لێقەوماوان درێژ دەکرد. ئەگەر گەنجێک یان کچێکی شۆخ لە تافی لاویدا کۆچی دوایی بکردایە، ئەوا (چەمەر)یان بۆ ساز دەکرد. بە هەلهەلە و دەهۆڵ و زوڕنا بەرەو گۆڕستانی شار بە ڕێ دەخرا، بە هەیوەی شێرە و ئاغەڕۆ پرسەکانیان گەرم دەکرد. لە بۆنەکانی بووکگواستنەوەدا بە چەپڵەڕێزان و گۆرانی و بەستەی کوردی و تورکمانی و عەرەبی، وەکو بزمارە بزەمارە و سەڵا سەڵا و سەمار سەمار بۆنەکەیان گەرم دەکرد، بە جۆرێک، کە منداڵان تا چەند هەفتەیەک

ئەحلام مەنسوور

ئەو گۆرانـی و بەسـتانەیان دەوتـەوە.
یارمەتیدانـی هـەژاران و هاوکاریکردنـی یەکتـر و یارمەتیدانـی دەسـتکورتەکان چەنـد جۆرێکـی هەبـوو کـە هـەر هەموویـان لـە هەسـتی مرۆڤایەتییـەوە هەڵقوڵابـوون. حەوشـەکانی گەڕەکەکانـی جـاران، سێ مـاڵ و چـوار ماڵیـان تێدا دەژیـا، حەوشـە گەورەکانیشـی شـەش مـاڵ و حـەوت ماڵـی تێدا نیشتەجێ بوون. ئێواران (کاسە هاوسێ)، واتە قاپی خۆراکـی دراوسـێ ئاڵوگـۆڕ دەکـرا. ئـەو ماڵەیشـی هیچـی نەبوایـە، بێ بەرانبـەر وەریـان دەگـرت.
خاوەن باخەکانی گەڕەکیش لە وەرزی کۆکردنەوەی بەرهەمـدا، خورمـا و هەنـار و میوەیـان بەسـەر ئـەو ماڵانەدا دابـەش دەکرد کە باخیان نەبوو. هەروەهـا باخەوانەکانیـش لـە بەشـەکەی خۆیـان بەشـی دراوسـێکانیان دەدا.
لە وەرزی هاوینانیشدا خەڵک لە سەربان دەخەوتن، لەسـەر ئـاوازی هـاژەی ئـاوی (ئەڵـوەن) خەویـان لێدەکـەوت، لـە کەنـاری (ئەڵـوەن)دا شـەوانە گەنجـە دەنگخۆشـەکان تا شـەوانی درەنگ گۆرانی و مەقامیان دەچڕی، شمشـاڵیان دەژەند. دونیایان پڕ لە ئاوازی خۆش و ڕەسـەن دەکرد، ئەو خۆشـی و ئاوازانە هـەر کـەس گوێـی لێیان بوایە، قەت لە بیری نەدەچووەوە.

ئەحـلام لـەو شـوێنەدا دەژیـا، بـەو جـۆرە شـەو و ڕۆژی دەکردەوە. بۆیە ئەو یادگارییانە کە لە ناخیدا چەسـپابوون و بوونـە هەوێنـی بەرهەمەکانـی، تـا لـە ئاخروئۆخری ساڵانی پەنجاکاندا شارەوانی پرۆژەی جادەیەکی نوێی ئەنجام دا، ئەویش لەپێناو گرێدانی شـەقامی (کۆپریـی گـەورەی دێریـن) بـە (پاشـە کۆپری)یەوە، کە بە (مەزرەعە)دا تێدەپەڕی. بە هۆی ئەو شەقامەوە هەر باخەکەی (چەلبی)یان بڕی کە پاشماوەی کرا بە عەرەسە و فرۆشرا.
ماڵی باوکی ئەحلام و ماڵی باپیرەی دوو عەرەسـەیان کـڕی و دوو خانـووی مۆدێرنیـان لـێ دروسـت کـرد. بـەم جـۆرە ماڵئاوایـی لـە یەکـەم ژینگـەی منداڵیـی خـۆی کـرد. بـەڵام تاوەکـو دواهەناسـەی یادگارییـە جوانەکانی (مەیدان) و (عەبدوڵڵا بەگ) لەگەڵیدا و لە دڵیدا دەژیا.
ماڵـی ئێمـە لـە (عەبدوڵـڵا بـەگ) بـوو، نزیکـەی (٥٠) مەترێک لە ماڵی (حاجی حەمە ساڵح)ەوە دوور بوو. لە بیرمە پۆلی چواری سـەرەتایی بووم، ڕۆژێکیان بە لای ماڵی ئەواندا تێپەڕیم و بەرەو (چایلغ) دەڕۆشتم. ئەحلام لـەو ڕۆژانـەدا تەمەنی نزیکـەی چوار سـاڵان بـوو، یاریـی قولقولانـی دەکـرد، بـەدەم یارییـەوە نـاوی گـوڵ و گوڵاڵەکانـی بـە عەرەبـی دەوتـەوە.

# ئەحلام مەنسوور

ئەحلام منداڵێکی خوێنگەرم و ڕوومەتێکی مانگی چواردەئاسای هەبوو، دوو پەلکی پڕی ڕەش و جوانی لە سەر شانەکانیەوە شۆڕ کردبووەوە. ئیتر لە پاش سەرەتای بارکردنیان بۆ هەواری تازەیان، کەم جار دەمبینی. تاوەکو بڵاوبوونەوەی بەیاننامەی (١١ی ئازاری ١٩٧٠) و گەشەکردنی ڕووناکبیریی کوردی، ئێمەش کۆمەڵێک ڕووناکبیر و ئەدەبدۆست، کۆمەڵەیەکی ڕووناکبیریمان دامەزراند بە ناوی (المنتدى الثقافي)، لەپێناوی گەشەپێدانی ئەدەب و ڕووناکبیریی کوردی (خانەقین)، لە دامەزرێنەرە ناسراوەکانی ئەو کۆمەڵەیە خوالێخۆش بوو (م. مەجید ئیبراهیم ڕەزا)، (شەهید مەجید غاندی)، (کەریم سۆران)، (ئەحمەد ڕەشپۆش)، (مامۆستا جەعفەر)، (د. ستار ڕەشید) و بەندە بوو. لەو ڕۆژانەدا ناودەنگی ئەحلام مەنسوور بڵاو دەبووەوە. ئێمەش حەزمان دەکرد بێتە ناو کۆمەڵەکەمانەوە، بۆیە پەیوەندیمان پێوە کرد و داوامان لێ کرد بێتە ڕیزی کۆمەڵەوە. ئەویش بە خۆشحاڵییەوە ڕەزامەندیی خۆی دەربڕی، بەڵام لەو سەردەمەدا زەحمەت بوو کچێکی شۆخ بێتە ناو بارەگای یەکێتیی مامۆستایانی کوردستانەوە کە بارەگای کۆمەڵەی تێدا بوو، بۆیە پێشنیازی کرد لە ماڵی مامۆستا (جەمیل محەمەد عەلی ئەرکەوازی) کۆبوونەوە ئەنجام بدەین. بەو جۆرە، دوو جار لەگەڵماندا بەشداریی کۆبوونەوەکانی کرد. بەڵام ئەوەندەی نەخایاند ڕژێمی شۆڤێنی لە بەیاننامەکە پاشگەز بووەوە. دۆخی شار بەرەو خراپی دەڕۆیشت، هەر یەک لە ئێمە کەوتینە شارێک، من لە (کەربەلا) گیرسامەوە و ئەحلامیش هەر لە (بەغدا) بوو، بەڵام لە دووریشەوە ئاگام لە بەرهەمەکانی بوو.

**ئەحلام مەنسوور لە بەغدا**

سەبارەت بەو ڕۆژگارەی کە ئەحلام لە کۆلێجی ئەدەبیات و بەشی زمانی کوردی دەیخوێند، لە هەمان کاتدا وەکو هەڵەبڕ لە دەزگای ڕۆشنبیریی کوردی دامەزرابوو، ئەویش بە یارمەتیی مامۆستا (حیلمی عەلی شەریف) کە لە ساڵانی حەفتاکاندا سەرنووسەری ڕۆژنامەی (هاوکاری) بوو. لە هەمان کاتیشدا، وەکو چیرۆکنووس بەرهەمی بڵاو دەکردەوە. دەربارەی ئەو ڕۆژگارە، چیرۆکنووس و نووسەری ناسراو (غەفور ساڵح) دەنووسێت: «ئەحلام لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا، وەکو کیژێکی شۆخی خوێندکاری خانەقین ڕووی کردە بەغدا بۆ خوێندن، لە کۆلێجی ئەدەبیات لە بەشی زمانی کوردی، ئەحلام بە هۆی پێشکەوتنخوازییەکەیەوە بووە جێی سەرنجی هەموو خوێندکارانی شارەکانی تری کوردستان کە لەو کۆلێجە بوون. ئیدی وەکو مێش لە هەنگوین بئاڵێت، ئاوا تێی دەئاڵان، هەموو هەوڵیان دەدا فریوی بدەن، ئەویش کیژێک بوو لە شارێکی وەکو خانەقین، نەدی و نەشارەزا گوێی بۆیان شل دەکرد، وەلێ ئەوانەی بەتەمای شلکردنی شتی تر بوون لێی، لە چیرۆکنووسی کوردەوە، تا شاعیری کورد ئاواتی گەورەیان ئەوە بوو ئاوڕیان لێ بداتەوە، وەلێ ئەو بەو کچییەی خۆیەوە زۆر سرک بوو، زۆر لەوان ڕاکردووتر بوو، لەوانە زۆرتر بیرکراوە و ڕووناکبیرتر و خوێنەرتر بوو، گاڵتەی بەو هەموو ئەقڵە پیاوسالارانە دەهات.» هەروەها دەڵێت: «ئەحلام زۆر ماندوو بوو، وەکو جەنگاوەرێک لە زۆر بەرەدا دەجەنگا، بەدبەختیی زۆر پاڵی پێوە دەنا بەرەو بێدەنگی و سەرقاڵبوون، دوور لە داهێنانەکەی.»

ئەوەمان ماوە بڵێین لە مەیدانی کوردایەتیدا داکۆکیکردن لە مافی هەژار و چەوساوەکانی گەڕەکی (عەبدوڵلا بەگ)، چەند تێکۆشەرێکی ڕێگەی ڕزگاریخوازی کوردستان لەو گەڕەکەدا دەژیان، وەکو (ڕەشید باجەلان، ئەحمەد خەیات هەمەوەند، مەلا عارف عەتار) لە تێکۆشەرانی بەرەی چەپیش، وەکو شەهید (نەسرەدین مەجید، دەلۆ خەلیل بەیرام، مەلا محێدین دای زادە، مستەفا سۆتە، شەهید عەبدولوەهاب قادر). لە ڕاپەڕینەکەی ساڵی (١٩٤٨)دا ئەم گەڕەکە بە پیاو و ئافرەتیانەوە ڕۆڵێکی گرنگیان بینی، بۆیە لەم

گەڕەکەدا بیروباوەڕی کوردایەتی و سۆسیالیستی زۆر بەهێز بوو. هەر بۆیە کاریگەریی خۆیانیان لەسەر ئەدەب و بەرهەم و ژیانی ئەحلام مەنسوور هەبوو. ئەحلام لەژێر کاریگەریی ژینگەی یەکەمیدا مایەوە و ڕەنگدانەوەیان لە هەموو بەرهەمەکانیدا بەرچاو دەکەوێت، نەک هەر لە چیرۆکەکانیدا ڕەنگدانەوەیان بەرچاو دەکەوێت، بەڵکو ئەو ڕەنگدانەوەیە ئاشکرایە لە وتارە سیاسییەکانیدا کە پڕن لە وشەی میلیی وەکو هەیرۆ، هەیوەی شێرە، ئاغەڕۆ و هتد. ئەحلام زادەی شارێکی پێشکەوتووی کوردستان و لە گەڕەکێکی دێرینی چاونەترسی کوردەواری وانەی یەکەمەکانی فێر کرد، بۆیە ئەحلام بە نووسەرێکی بوێر و چاونەترس و ڕاستگۆ و خاوەن هەڵوێست مایەوە. دەستەخوشکی شەهید (لەیلا قاسم)ی هاوڕێی منداڵی بوو. لە مەیدانی هەژارنشینی (خانەقین)ەوە هاتە مەیدانی ئەدەب و سیاسەت. لە دونیای ڕووناکبیریدا جێگەی بەرزی بۆ خۆی پێکەوە نا، تاوەکو لە ڕێکەوتی (٢٠١٣/١/١٠) گەڕایەوە باوەشی (ئەڵوەن)، دیسان لە کەناری (ئەڵوەن)دا ئارامی گرت و هەتاهەتایە ناوی بە زیندوویی دەمێنێتەوە، چونکە نە قەڵەمەکەی فرۆشت، نە ئامادە بوو قەڵەمەکەی بە کرێ بدات، بۆیە بوو بە مایەی شانازیی شارەکەی و هەموو کوردێکی دڵسۆز.

سەرچاوە:

ئەحلام مەنسوور وەکو شەهیدێک مرد، غەفوور ساڵح عەبدوڵڵا، کوردستانی نوێ، پاشکۆی ئەدەب و هونەر (٨١٠) ڕێکەوتی (٢٠١٣/١/١٦).

# چەند وتارێکی ئەحلام مەنسوور:

**١- ڕەهەندەکانی کەسێتیی نووسەر**

هەموو مرۆڤێک خۆزگە دەخوازێ ببێت بە نووسەر. کاتێک کە بەرهەمێک دەخوێنێتەوە، لە دڵی خۆیدا دەڵێت: «خۆ ئەم نووسینە لە دڵی مندا بوو، حەیف نەمنووسی، تۆ بڵێی ئەم نووسەرە دڵی منی خوێندبێتەوە؟ نا نا...» ئەمەیە جیاوازی لە نێوان خوێنەر و نووسەردا، تا ئێستا کەس نەیتوانیوە پێناسەی ئەدەب و هونەر بکات.

ڕەخنەگران و توێژەران هەریەکە و بە شێوەیەک پێناسەی ئەدەب دەکەن و وتوویانە: «بەهرەیە، سروشە، ئیلهامە، توانایە، سیحرە، لێهاتووییە.» بونیادگەرەکان کە چەندین بیرمەندن، بۆچوونە کلاسیکییەکانیان ڕەت کردەوە و سەدان کتێبیان لەسەر نووسین نووسیوە. من دەڵێم نووسین نەخۆشییەکی دەروونییە، کاتێک کە کورد لە حەفتاکاندا بەردبارانی کردم، چیرۆکی (پرد) و ڕۆمانی (ئەڵوەن)ی دووەمم نووسی، دایکم لە لایەک و کۆمەڵگە و هاوڕێکانم لە لایەکی دیکە فشاریان دەخستە سەرم. بە کورتی، مەینەتی گەمارۆی دام. واتە وردەوردە نووسین بوو بە (ماسۆشیەت). قەت لە کاتی خۆشیدا نانووسم، بەڵکو دەگریم و دڵم جۆش دەدات.

بۆ نموونە لە ڕۆژانی ڕاپەڕیندا، لە (بەغدا) کارەبا نەبوو. من و برا گەورەکەم شەوان گوێمان لە ڕادیۆ دەگرت، لە شەوی ئازادکردنی (کەرکوک)دا بێژەرەکە وتی: «ئاڵاکانی کوردستان لە ئاسمانی کوردستان دەشەکێنەوە.» زۆر گریام، ئێستایش کە ئەم یادە تۆمار دەکەم، دەگریم، چونکە ئازادکردنی (کەرکوک) مژدەیەکی خودایی بوو. هەر گریام و گریام، لە ئەوپەڕی خۆشی و بەختەوەریدا بووم، نەمتوانی یەک دێڕیش بنووسم. تا ئەم ساتەش هەر دەگریم. هەواڵی شەکاندنەوەی ئاڵاکان ئەوپەڕی بەختەوەریی پێ بەخشیم، ئەو شەوە خۆشترین شەو بوو لە ژیانمدا.
ئەمشەو کە دەکاتە (٢٠١١/١١/١) باسی یادی ئەو شەوەتان بۆ دەگێڕمەوە، لاپەڕەکەی ژێر دەستم بە هۆی فرمێسکبارینەوە تەڕە. براکەم (عەلی مەنسوور)، لە سەر پشت ڕاکشابوو، منیش لە ساڵۆنەکەی ماڵی باوکم بە دیار ڕادیۆ بچووکە ڕەشەکەوە، وەکو پشیلە دانیشتبووم. ئیتر هەر گریانەکەم بە بیر هات و شەکاندنەوەی ئاڵاکان.
خەسڵەتەکانی ئازادکردنی (کەرکوک)م بە بیر نایەتەوە، ئێزگەی (مۆنت کارلۆ، دەنگی ئەمریکا) و (ئێرە لەندەنە)، هەواڵەکانی وەکو یەک بوون و تەنها جیاوازی لە تۆنی دەنگی بێژەرەکاندا هەبوو. بۆیە دەڵێم نووسین لە لای من حاڵەتێکی دەروونییە، لە ساتی خۆشیدا یەک دێڕ نانووسم و لە ساتەکانی ناخۆشیدا کە حاڵەتی خەمۆکی دەمگرێ و بەدەم جگەرەکێشانەوە دەنووسم. بۆیە خوێنەران شارەزای نووسینی منن و دەڵێن: «بۆچی ئەحلام مەنسوور ڕەشبینە و هیوابەخش نییە، خۆزگە گەشبین بێت؟» بۆیە یەکەم جار نموونەی خۆمم بۆ هێنان، چونکە نەخۆشیی خەمۆکیم هەیە.
(نزار قەببانی)، شاعیری گەورەی عەرەب، نەخۆشیی نێرگزیەتی هەبوو، هەروەها زۆر هەڵدەچوو، سیاسەت و عەشقی تێکەڵی یەکدی دەکرد، ڕۆمانسی بوو. نموونەیەک بۆ هەڵچوونی، لە شیعرێکی ساڵانی هەشتاکاندا هەستت دەکرد گوو دەبارێنێتە سەر عەگاڵی شێخ و میرەکانی وڵاتانی کەنداوی عەرەب.
شاعیری گەورە و پیرۆزمان مامۆستا (فایەق بێکەس)، شۆڕشگێڕ و یاخی بوو، لە قەسیدەی بیستوحەوت ساڵەکەیدا هەموو کورد وتی: «دژی بەریتانیای داگیرکەرە، دژی (ئەدمۆنز) و هەموو دەلالەتەکان ئاماژە بۆ بەریتانیای داگیرکەر دەکەن.»
ئەم شیعرەم لەبەر بوو. هەروەها لە کوردییەوە کردمە زمانی عەرەبی. هەستم کرد ئەم شیعرە برین و هاوار و گلەییەکە لە (سۆڤیەت) و (شیوعییەکان)، بۆ ئەوەی لە بۆچوونەکانم دڵنیا بم. شیعرەکانم برد بۆ گەورەترین عەقڵی عێراقی، وتی: «ئافەرین». ڕاکەی لەگەڵ ڕاکەی من بوو. ئێستا ئەگەر بڵێم وا بوو، هەموو کورد بە کەر و گەوجم دەزانێ. هەر دەچن بە گژمدا و ڕووڕەشم دەکەن. دڵنیام کە مامۆستا (بێکەس) زیرەک بووە و (سۆڤیەت) یشی هەر بە داگیرکەر زانیوە لە ڕێی حیزبە شیوعییەکانی ئەو کاتەوە.
(ئەبو ئەلقاسم ئەلشابی): قەسیدەی (ئیرادەی ژیانی) نووسی. قەسیدەیەکی کاریگەر بوو. عەرەبێک نەبوو لەبەری نەکات. ئاوازیان بۆ دانا و کرا بە گۆرانییەکی سیاسی. بە جەستە لە (بەغدا) بووم، بە دڵ و دەروون لە کوردستان بووم. لە بیستنی شەهیدبوونی پێشمەرگەیەک، یان زیندانییەک لە (ئەبوو غریب) لە سێدارە بدرایە، کاتێ شەوان لە ڕۆژنامەی (هاوکاری) دەگەڕامەوە ماڵەوە و بە سەر قادرمەی بەرانبەر بە دەرگای ژوورەکەم سەر دەکەوتم، هاوارم دەکرد و بەدەم گریانێکی کوردییەوە ئەم شیعرەم بە ئاوازەوە دەچڕی.
دایکم بە برا و خوشکەکەمی دەوت: «گرتی». یانی حاڵەتی شێتی گرتمی.
لەم پایزەدا کە شۆڕشگێڕان لە (تونس) خۆپیشاندانیان دەکرد و هاواریان دەکرد و ئەم قەسیدەیەی شاعیری خۆیان بەدەم هاوارەوە دەوتەوە.
(میسر)، (سوریا)، (لیبیا) و (یەمەن)، شۆڕشگێڕان بە خوێن هەمان ئەو شیعرەیان دووبارە و سێبارە دەکردەوە.
(هۆڵدەرلین)، گەورەشاعیری (ئەڵمانیا)، نەخۆشیی (مەنیخۆلیا)ی هەبوو. واتا ئازاردانی خود، ژیانی بە گریان بەسەر برد. هاوڕێکەی و ژنەکەی ڕێیان نەدا فڕێ بدرێتە شێتخانە. بە ئەوپەڕی میهرەبانییەوە خزمەتیان دەکرد، تا مرد. چۆن دەڵێن (سارتەر) یانی (فەرەنسا) و (فەرەنسا)یش یانی (سارتەر): هەروەها (هۆڵدەرلین)، یانی (ئەڵمانیا).

ئەحلام مەنسوور

(مەنیخۆلیا)، (فەرەنسییەکان) پێی دەڵێن: «میلانکۆلی». ترسناکترین نەخۆشیی دەروونییە، خاوەنەکەی هەر دەگری، تا گیان لە دەست دەدات.

بێینەوە سەر (دۆستۆیڤسکی)، لە دەروونناسیدا بلیمەت بوو، هاوتای نەبوو. نەخۆشیی (فیَ)ی هەبوو، هەروەها قوماری دەکرد، لەگەڵ خاوەنی چاپخانەکاندا ڕێکدەکەوت ڕۆمانێک بە قەبارەی ئەوەندە لاپەڕەیان بۆ بنووسێ، پێشەکی پارەکەی وەردەگرت و لە قومارخانەکاندا دای دەنا، گۆشەگیر دەبوو، هەزاران لاپەڕەی دەنووسی و ژنەکەی لە ژێر دەرگاوە کاغەزی بۆ ڕەوانە دەکرد. دەڵێن: «کاتێ کە خوداوەند مرۆڤی دروست کردووە، (دۆستۆیڤسکی) لە لای دەستی دانیشتبوو.»

(دۆریان گرەی) بەرجەستەی نەخۆشیی (نێرگزیەت) دەکات، یانی خۆشەویستیی خود، بگرە هەر لە (نزار قەبانی)یەوە، تا هەموو شاعیرانی جیهان عاشقی خۆیانن.

گەورەشاعیری ڕووسیا (یەسەنین) نەخۆشیی وێرانکردنی خودی خۆی هەبوو. لە ئوتێلێکدا خۆی هەڵواسی و پەتەکەی ملی جەڕ دا و مرد. لە ڕادیۆی (ڕووسیای عەرەبی) گوێم لە بەرنامەیەکی تێروتەسەل لەسەر خۆکوشتنی (یەسەنین) گرت. بێژەرەکە دەیگوت: «بە دەستی خۆی خۆی وێران کرد.» ئەم نەخۆشییە لقێکە لە خەمۆکی، ژنە ئەکتەرەکەی خیانەتی لێ کرد و ڕەدووی ئەمریکییەک کەوت و ڕوویان کردە (ئەمریکا). هەروەها بێژەرەکە دەیوت: «گوایە دەسەڵات یەسەنینی ڕاو ناوە.» بۆیە خۆکوشتنەکەی دەگەڕێننەوە سەر دوو هۆ، بەڵام هێشتا هۆی خۆکوشتنی (یەسەنین) لای توێژەران و ڕەخنەگران ساغ نەبووەتەوە.

(سادقی هیدایەت) نەخۆشیی خەمۆکیی دوو جەمسەری هەبوو، وەک (ئەرنست هەمنگوای و کافکا)، نەخۆشیی (شیزوفرینیا)ی بوو. (جەیمس جۆیس) لە خوێندنەوەی نەستی مرۆڤدا بلیمەت بوو، ژنەکەی خیانەتی لێ کرد، کچەکەی عاشقی دەروونزان (یۆنگ، یان ئادلەر) بوو. مەینەتیی زۆری بینیوە و دامەزرێنەری ئەدەبی مۆدێرنە. (یۆلسیس) گەورەترین شاکاریەتی و کەس نەیتوانیوە دەقاودەق وەری بگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی. کە لە (فەرەنسا) بووم، دەقەکەم دەستکەوت و خوێندمەوە، تا تێگەیشتم، گیانم دەرچوو. لە کاتێکدا لە (بەغدا) ئەنسکلۆپیدیای (جۆیس)م خوێندبوو. هەروەها (مۆرا دبلنی)، سکرتێری بەشی ناوخۆیی کچانی جیهان، زۆر یارمەتیی دام و خزمی (جۆیس) بوو.

(مایاکۆفسکی)، شاعیری گەورەی ڕووسیا، خۆی کوشت، نەخۆشیی خۆبەزلزانینی هەبوو، (مایاکۆفسکی) شاعیری شۆڕشی ئۆکتۆبەر بوو، جلی سەیری لە بەر دەکرد، هەروەها ناوی بە شاعیری (ملیۆن قەسیدە) دەرکرد، هەموو گەل چەپڵەی بۆ لێ دەدا، شیعرەکانی حەماسی بوون، بەڵام لە دواییدا هەندێ لە سەرکردەکان بەربەرەکانێیان کرد، زۆریش تووڕە بوو، ئیتر گیرەشێوێنی گەمارۆی دا و خۆی کوشت. (مایاکۆفسکی) سیمبولی مەزنی ڕووسیا بوو. حەیف سیاسەتمەداران قەت ڕێک ناکەون، لەگەڵ ئەدیب و نووسەراندا!

(ئەلبێر کامۆ)ی فەیلەسوفی بوونگەرایی و ڕۆماننووس و ڕۆمانسی، لە لای (فەرەنسییەکان) زۆر ئازیزە، لە (سارتەر) زیاتر خۆشیان دەوێت. دەیانوت: «کامۆ تەڕە و سارتەر وشکە.» ڕۆمانی (نامۆ) لە کۆرسی دووەمی زمان لە (سۆربۆن)، وەک میتۆدێک دەخوێنرا، چونکە شۆڕشێکی گەورەی لە زمانی (فەرەنسی)دا کرد. ڤێربی ڕابوردووی پێکهاتەی زۆر بەکار دەهێنا. چونکە ئەو ڤێربە بە بەردەوامی بەکار دێت، واتە هەموو ڕۆژێک مرۆڤ دەموچاوی دەشوات و نان دەخوات و باران دەبارێت. بۆ ئەوەی خوێندکار شارەزای ئەوە بێت، ئامۆژگارییان دەکرد (نامۆ) بخوێنێتەوە. منیش هەوڵم دا بیخوێنمەوە، لەگەڵ بەکارهێنانی فەرهەنگی (سوهێل ئیدریس)، هەندێ دەقیش

لە کۆرسی یەکەمدا دەخوێنران. کامۆ زۆر باسی ڕێکەوتی دەکرد، لە پێکدادانی سەیارەدا گیانی لە دەست دا، پڕوپاگەندەیەک هەبوو دەیانوت: «گوایە حکومەت کوشتی، چونکە بەرگریی لە شۆڕشی (جەزائیر) کردبوو.»
(بودلێر)، دایکی شووی بە ئەفسەرێکی سەربازی کردبوویەوە. هەموو ڕۆژێ نامەی بۆ دایکی دەنووسی. ئەوانەی دایکیان شوو بکاتەوە، کەسێتییان وێران دەبێت. عەقڵیان ئازاری دەروونیان دەدات. زۆر نیگەران دەبن، هەروەها خەمۆکی کاریان تێدەکات و لە ئینکاریدا لە کەلی شەیتان نایەنە خوارەوە. بۆ نموونە، یەکێکمان ڕەوانە کرد بۆ زانکۆی (فرۆید) لە (ڤیەننا) کە نەخۆشخانەیەکی دەروونیی گەورەی لێوە نزیک بوو. بۆ ماوەی سێ ساڵ چارەسەریان کرد. بوو بە دەروونزانێکی مەزن، بەڵام کێشەی شووکردنی دایکی هەر وەکو خۆی لە مێشکیدا مایەوە، وەک بڵێی هیچی بە هیچ نەکردبێ. هەروەها هاوڕێیەکی (بەغدا)ییم هەیە هەمان کێشەی هەیە و بە کەس چاک نەبووەتەوە. پێکهاتەی عەقڵیان تەواو نەگۆڕە. ناتوانن لەگەڵ کەسدا بژین. لەگەڵ دار و بەردا شەڕ دەکەن. زۆر زیرەکن، قسە هەر قسەی خۆیانە. بە کورتی، وێرانن، هەر وێران.
لە کۆتایی وتارەکەمدا یەک شت هەیە، حەز دەکەم بڵێم....
نووسەرانی کوردم بە نموونە نەهێنا، چونکە کێشەکە دەخەنە قاڵبی ناوزڕاندنەوە.

## ٢- سکاڵای بەردێک

ڕۆژ دەبێتە شەو، شەو دەبێتە لۆکە، گەرمای نیوەڕۆ دەبێتە دۆزەخ، سەهۆڵبەندان دەبێتە خەڵوز. لە ناو مەقەڵیی ڕۆژگاردا هەموو جۆرە خەمێک دەتوێتەوە، خەمەکان تێکەڵی یەکدی دەبن، کاتەکان تێک دەشکێنن، گریان دەبێتە پیشە و سووتەمەنیی جەنگەکان، تەنافی مێژوو هەر درێژ دەبێتەوە، پێنووس دەبێتە جگەرە، گڕی جەنگەکان ناخەکان داگیر دەکەن، مەرگ بە بەردەوامی سەمای خۆی دەکات و ژیان بەرەو نەبوون خۆی دەپێچێتەوە.
من لە نێوان زەوی و ئاسماندا، وەکو بەرد شوێنی خۆم بەجێ ناهێڵم، زریانیش ناتوانێت پێستم کاڵ کاڵ بکاتەوە. هەر چاوەڕوانم، ناتوانم، ئیدی شانەی ئاییندە مووە سپییەکانی سەرم شانە دەکات، یاخود مەرگ سەرم دەتاشێت؟ بەرەبەیان و سپێدە چاوی وشەکانم کوێر دەکەن، مرۆڤە کارتۆنییەکان لە سەر دیوارەکان دەبنە پڕوپاگەندەی خەونەکان، خەونیش دەبێتە کۆڕێکی ئامادەکراو، ئەڵقەکان ون دەبن و

هیچ... هیچەکان دەبنە کێشە، نان، دۆلار، کارەبا، گۆشت، سەوزە، سەیارە، کۆشک، باڵەخانە و تەلار. هەناسەکانم حەشار دراون، چاوەکانمان کوێرن، ژیان ئێمە دەبینێ، بەڵام ئێمە کولەمەرگی دەبینین، مەینەتییەکان دەبنە عەرەبانە و هەر پاڵیان پێوە دەنێین، هەروەها حەماڵین، تەنها بارەکانمان جیاوازن، ڕووبەڕووی هێڵەکان دەخولێینەوە، ئاسۆیش پایزییە، کونکونە، خوێن لە کونەکانیەوە دەتکێتە سەر شانەکانمان.
ئای لەم بەیانییە شوومە، جەنگ دەبارێت و پەنجەکانم دەبنە سووتەمەنی.
وتم بەردم، کەس بۆی نییە هەڵم بگرێت یان بمهاڕێت، باوی نەقشکردنیش نەماوە، لەپەکانم دەبنە تەپڵەکی جگەرە و ئەستێرەکان خۆیان دەکوژن، هەورەکان سەوز دەبنەوە، گیاکانیش مانگ دەلاوێننەوە، کاتە تێکشکاوەکان دەچنە ناو یەک و دەبنە پەتی سێدارەکان.
ئای لەم ساتە نەعلەتییە کە برووسکە شەهیدبوونی بیروباوەڕ بڵاو دەکاتەوە، چیم دەوێ؟ هیچ، دنیا بە من ناگۆڕێت، سەرمایەداری بووە بە شێرپەنچەی ڕۆح، نیشتمانەکان لە ناو گیرفاندان، منداڵانیش دەکرێنە کرم...
بۆیە پەنجەرەکەم شیوەن دەکات، دەرگاکانیشم گیانیان لە دەست دا. بووکەشووشەکانی تیشکی هەتاو دەگرین، لەباتیی باران، بەردی بێزاری دەبارێ، هەموومان وەکو (مارسیل پرووست) بەدوای زەمەنە ونبووەکان دەگەڕێین. شانەکانم بوون بە بێشکە، دووکەڵی جگەرەکانیشمان بوون بە هەورێکی سوور، کێ دەدۆڕێ، کێ دەیباتەوە؟ تۆ بڵێی هەردوو تای تەرازووی عەدالەت ژەنگاوی و قوپاو بن؟

ئەحلام مەنسوور

یەک + یەک = دوو
مەرگ – ژیان = هیچ
هەناسەکان بوون بە ئاگر، خۆسەویستی ئیفلیج بووە، شیعریش سەرەتاتکێ دەکات، کلیلی نهێنییەکان کوێرن، ناتوانن دەرگای ڕاستی بکەنەوە، هەر منێکی بەرد دەزانم چ جۆرە کودەتایەک فریوی داوین. هەر منێکی ئیسفەنج چ جۆرە چڵکاوی سیاسەتمەدارانمان هەڵدەمژم، هەر منێکی خۆڵ دەزانم چ جۆرە قورسایی تانک و زرێپۆشێک لە سەر نێوچەوانم هەڵدەگرم، هەر منێکی خاک دەزانم چ جۆرە جەنگم لەسەر دەکرێ، بۆیە ناچار دەبم، جەنگاوەران قووت بدەمەوە، خۆیان و خەونەکانیان، پۆستاڵەکان چاوەکانم کوێر دەکەن، بۆنی باروت هەناسەم توند دەکات، ناچارم تف ڕۆ بکەم، دام دەگیرسێن و بە دواهەناسەی ژیان دەمکوژێننەوە، کێڵگەکانم دەبنە سەنگەر، گەڵای درەختەکانم دەبنەوە چەتر، بناری شاخەکانم دەبنە تاوان، بۆیە ئاشتیخوازی دواسرودمە، نیشتمانپەروەری پێستی کوردایەتیمە. لە بنی دەریای دڵڕەقیدا فرمێسکەکانم تێکەڵی ڕووبار و جۆگە خوێناوییەکان دەکەم، لە زیندانەکانیشدا هەر سێبەری من دواپاڵەوانی ئەم چەرخە جەنجاڵ و بەدفەڕەیە، ئای لە دواهۆنراوەی عەشقی پەلکەزێڕینەم. ئای لە خۆم، مەگەر سوێند بە چاویلکە بخۆم، مەگەر تاڵە مووە سپییەکانی قژم هەڕاج بکەم، مەگەر ڕاستەی منداڵان بدەمە دەم یەکدییەوە و بیانکەم بە ڕێگەیەکی تازە و لە سەری بڕۆم، بەڵام بۆ کوێ؟ خۆم وردوخاش بکەمەوە، یان بتەقمەوە، یان پارچەکانی بکەم بە گوللە؟
من هیچ نیم، من بەردێکی بێدەنگم، ببوورن، سکاڵام بۆ کردن، تکایە گوێیەکانتان دابخەن و چیدی گوێ لە بێدەنگیم مەگرن.

### ٣- ڕاستی لە خۆناسیندایە

کاتێ لە سوکراتیان پرسی: ئایا ڕاستی چییە؟ وەڵامی دانەوە و پێناسەی ڕاستیی بۆ کردن. وتی: «ڕاستی لە خۆناسیندایە.»
ڕاستی کرد، ئەو مرۆڤانەی کە ون و وێڵ و سەرگەردانن، لە لای دەروونناسی (فرۆیدی)، واتە ئەو دەروونناسانەی کە خوێندکاری زانکۆی (فرۆید)ن، لە (ڤیەنا)ی پایتەختی نەمسا دەردەچن و بڕوانامەی دەروونناسییان پێ دەدرێت. سێ جۆر بڕوانامە دەدەن: دەروونناسی، عەقڵ و دەمارەکان

(الاعصاب). زیرەکە، واتە پسپۆڕی جیاوازن. بۆ نموونە (د. سعد الوتری) پسپۆڕی لە نەشتەرگەریی مێشکدا بووە، واتە پەیوەندیی بە دەروونناسییەوە نەبووە. لە ناوەڕاستی (بەغدا)دا، لە شوێنی (حافظ القاضي) کلینیکی هەبوو، بەر لە چەند ساڵ کوشتیان. ئەو پزیشکانە ناگەنە ئاستی پزیشکی (ڤیەنا).

پزیشکەکانی (ئەڵمانیا) یەکسەر نەخۆش ڕەوانەی نەخۆشخانە دەکەن. دکتۆرێک لە منداڵییەوە ئازاری نەچەشتبێ، نابێ بە دکتۆرێکی چاک، هەست بە ئازاری نەخۆشەکە ناکات. ڕووس خۆیان بە (پاڤلۆڤ)ەوە بەستووەتەوە کە دکتۆرێکی دەمارەکان بوو. هەر خوێندکارێکیش کە لە قوتابخانەی (ڤیەنا) وەردەگیرێت، یەکەم جار چارەسەری بۆ دەکەن، دەبێ ئەگرەسیڤی نەبێت، نەستی خوێندکار دەخوێنرێتەوە. مامۆستاکان بە چارەسەرکردنی خوێندکارەکە لە ئاییندەدا فێری تەکنیکی چارەسەرکردنی نەخۆشەکانی دەکەن.

چارەسەرکردنی هەر جۆرە نەخۆشییەک تەکنیکی تایبەتی هەیە. کاتی چارەسەرکردن (٤٥) خولەکە. قسەی ئاسایی لە کلینیکدا ناکرێت. چارەسەرکردن ڕێوڕەسمی تایبەتی خۆی هەیە. دەبێ دکتۆر ئەورووپییانە هەڵسوکەوت بکات. دەرگا بۆ نەخۆشەکەی دەکاتەوە، چاکەتەکەی بۆ دادەکەنێ. لە پشتی دەرگادا هەڵیدەواسێ و کاتێ نەخۆشەکە بەرانبەری دادەنیشێ، دکتۆر (٥٠٪) دەزانێ چییەتی. سیمبول زۆرن بۆ ئاماژەکردنی دەموچاویان، یان جووڵاندنەوەی دەست یان سەر و... هتد. فایلێکی بۆ دەکاتەوە، ناوی نەخۆشەکە دەنووسێت و کارەکەی و شارەکەی و پلەی خوێندنی، باری ئابووری و... مەرجە لە دەروونناسیدا ئینسکلۆپیدیا بێت. واتە هەموو شتێک بزانێت. چونکە سەدان نەخۆشی جیاجیا ڕووی تێدەکەن. دەبێت زمانی بزانێت و تایبەتمەندیی ناوچەکەی، کوڕ بێ یان کچ، یان نۆبەرە بێت، یان منداڵی دووەم و سێیەم و... دکتۆر دەست بە چارەسەر دەکات. هەر لە سەرەتادا قۆناغی منداڵی و یادەوەرییەکانی ئەو قۆناغە شی دەکاتەوە. ئینجا لە قۆناغی هەرزەکاری و گەنجی دەکۆڵێتەوە. دەبێ نەخۆش ترسنۆک نەبێ

ئەحلام مەنسوور

و بە ڕاشکاوی قسە بکات، بۆ ئەوەی یارمەتیی دکتۆر بدات و یارمەتیی خۆی بدات بۆ ئەوەی لە خۆی بگات و زوو چاک بێتەوە.

مرۆڤ سەرتاسەری تەمەنی پێویستی بە دەروونناسی دەبێت. چونکە دەروونناسی یارمەتیی نەخۆش دەدات بۆ ئەوەی لە خۆی بگات.

نەخۆشی وا هەیە نهێنییەکانی دەشارێتەوە. دکتۆر هێندە هونەری خۆی لەگەڵ بەکار دەهێنێ، تا بە هەزار حاڵ نەخۆش وەڵامی دەداتەوە. نەخۆش هەیە شەرمنۆکە، نهێنیپارێزە. لە هەمان کاتدا دکتۆر ماندوو دەکات و درەنگ چاک دەبێتەوە.

حەوتەمین دەروونناس لە جیهاندا دەروونناسی من بوو. بلیمەتێک بوو بۆ خۆی. کە (لەیلا قاسم) کوژرا، خەمۆکی ڕووی تێکردم. هەر دەگریام، ناچار بووم بچم بۆ لای ئەم دەروونناسە. بوو بە باوک و دایک و مامۆستام. بێکەس بووم لە (بەغدا)، بەردباران دەکرام، ئەو بەردەکانی کۆ دەکردەوە و دەیکردنە کتێب. بۆیە هەوڵی دا ببم بە ڕۆشنبیرترین کچی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

لە سەرەتادا خەونەکانمی شی دەکردەوە و منیش ترسنۆک نەبووم. یارمەتیی یەکترمان دەدا بۆ ئەوەی بە زووترین کات چاک ببمەوە. وەک وتم، مێشکی ئینسکلۆپیدیا بوو. هەرچی هەبوو لە ناو ئەو مێشکەیدا، بە منی بەخشی. فێری شیکردنەوەی خەونی کردم لەسەر ڕێگەی (فرۆید). منیش وردەوردە بە خۆم نەدەزانی، بووم بە دەروونناسێکی بچکۆلە، لەبەر ئەوەی چیرۆکنووس و شیوعی بووم، زوو پێشکەوتم، باسی هەموو جۆرەکانی نەخۆشیی دەروونیی بۆ کردم، تەنها پزیشک نەبوو، دەرماننووسینی نەدەزانی، بەڵام کلیلی چارەسەرکردنی نەخۆشیی دامێ، بووم بە مامۆستا و منیش بووم بە قوتابیی ئەو قۆناغە.

قۆناغێکی زێڕین بوو لە تەمەنمدا، دایکم لە لایەک دەیچەوساندمەوە.

ئەگەر دوابکەوتمایە، براکانم لە بەردەرگا چاوەڕێیان دەکردم و هەر بە شەق دەیانبردمە ژوورەوە. من فێر بووم بچم بۆ ئاهەنگەکانی تیپی سەمفۆنیی نیشتمانیی عێراقی، گوێ لە باخ و بتهۆڤن بگرم، لە گەڕانەوەمدا شەقم دەخوارد، بووم بە مرۆڤێکی ئازا و شارستانی، فێری فەرەنسی بووم و بە ئاسانی ئینسکلۆپیدیای (جەیمس جۆیس)م دەخوێندەوە. بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ خەریکی خوێندنەوەی فەلسەفەی بوونگەرایی بووم. بە کورتی، (٢٥) ساڵی تەمەنم بۆ ئەدەب و شیعر و چیرۆک و فەلسەفەی ئەورووپی تەرخان کرد. جوانترین فیلمی سینەماییم دەبینی، لە لایەک (عوسمان فایەق) و (سوعاد ئەدیب) و کێشە سیاسییەکانی دەزگای ڕۆشنبیری کوردی بوەستێ، لە لایەکی نەفیکردنم بۆ وەزارەتی کشتوکاڵ کە بووم بە هەڵەبڕ لە گۆڤاری شۆڕشی کشتوکاڵ، هاتوچۆی چاپخانەم دەکرد و کاک (جەمال خەزنەدار) سەرپەرشتم بوو. نەمدەتوانی بە یەک مەودا بژیم، بەڵام بە چوار مەودا دەژیام و ناوبانگم دەرکرد. لە لایەک دکتۆر چاکی دەکردم، لە لایەکی ماڵەوە و دەزگای ڕۆشنبیری وێرانی دەکردمەوە.

مامۆستا (هێمن) و (کاکە مەم بۆتانی) پشتیان گرتم. ورەم دانەبەزی و پزیشکەکەم بە هەڵوێستەکانم دڵی زۆر خۆش بوو و پشتی بەرنەدام، تا بۆ ماوەی سێ ساڵ زیندانی کرا.

سیاسەتی جیهانی پشت بە دەروونناسی دەبەستێت، دەروونناسەکەم ئۆپۆزسیۆن بوو، یەکسەر خانەنشینیان کرد و لە تەمەنی (٧٥) ساڵیدا جەڵدەی مێشک لێی دا و کۆچی دوایی کرد.

تەنها من لە نزیکەوە دەمناسی، بەتەمای شۆڕشێکی گەورە بوو بۆ ئەوەی عێراق لە دەسەڵات ڕزگار بکات، بەڵام زیندانییان کرد و مرد. دوو کۆڵەکەم ما. چوار بوون، تەنها پێنووسەکەم ما و میللەتێک کە شەو و ڕۆژ بە قوربانی دەبم.

تێبینی: قوتابخانەی (ڤیەنا) جوولەکە بە ڕێوەی دەبەن، بڕوانامە بە عەرەب نادەن.

